# رۆشنبیری نوێ

ژمارە ٧٨ کانونی یەکەمی ساڵی ١٩٧٩



بیرەوەری 6 ساڵەی رۆشنبیری نوێ

# وشەی پرشنگدار

تاقی‌کردنەوەی پار سەرکەوتنی ئەو ڕێڕەوە سیاسی‌یەی ساغ کردەوە کە کونگرەی بەرزی بەغدا دەست نیشانی کرد بو هەروەها پوچەلی‌ی‌ئەو ڕێڕەوە خۆبەدەستەوەدانی‌یەی ساغ کردەوە کە ڕژێمی میسر بە پێی ڕێککەوتنەکانی ئۆردوگای داود پەیرەوی کرد .. ڕای گشتی جیهان ڕێزی بڕیارەکانی کۆنگرەی بەرزی بەغدای گرت‌و بە جیددی هەلس‌و کەوتی لە گەلدا کردو چەندین پێوەندی گرنگی نیز دەولەتان پشتگیری‌یان کرد هەروەك لە وکۆنگرە ئیسلامی‌یەدا ڕوویدا کە لە فاس گیراو لە کۆنگرەی بەرزی ئەفریقا لە مغروفیاو لە کۆنگرەی بەرزی بێ‌لایەنی لە هاڤاناو ... لە نیزەندە جۆر بە جۆرە جیهانی یەکانداو هەلویستی‌زۆر لە ولاتانی ئەوروپا گۆڕاو پەرەی‌سەند کە لە مەوبەر سلیان لە نواندی هەلویستێکی بەرامبەریانە دەکرد .. لە هەمان کاتدا بە تەواوەتی‌و بۆ هەموو زەین ڕوونێك هەلویستە خۆ بەدەستەوە دەری یەکان‌و سەر شۆری‌یەکانی ڕژێمی میسر ڕوون بۆوەکە بۆ سودو قازانجی زایونی دوژمن نواندنی‌و پێوەبوونی سیاسەتی خیانەتکاری ئەم ڕژێمەش دەرکەوت کە لە سەر ئاستی عەرەبی‌و ئیسلامی وئەفریقایی ولە هەموو جیهاندا پتر گۆشەگیرو تەرەکەمە بووە ..تەنانەت برا بەشەکانی لە ڕێککەوتنە خیانەتکاری‌یەکاندا وایان لێ هاتوەکە گومان لە بەردەوام بوونی ئەم ڕێڕەوە دەکەن کە پەیڕەوی کردوە .

براینە ئەم دەرئەنجامە گرنگە سەرکەوتنێکی مەعنەوی‌و سیاسی نەتەوەی عەرەبەو بەلگەی ئەوەیەکە کاربەدەستان لە ولاتە عەرەبیەکاندا کاتێك بڕیاری نواندنی هەلویستێکی جیددی دەدەن‌و کاتێك تەنانەت ئەو بەشە کەمەی توانایان بۆ خزمەتی مەسەلەی عەرەب دادەنێن ئەوا ئەو کاتە دەتوانن لە سەر ئاستی نەتەوەیی‌و لە سەر ئاستی نێو دەولەتاندا ئەنجامی کاریگەرو گرنگ بە دەست بهێنین .

**سەرۆکی فەرماندە**
**صدام حسین**
**لە کۆنگرەی بەرزی عەرەبدا**
**لە تونس**



**بەڕێز سەرۆك لە سەردانەكەی پاش نیوەڕوی ڕۆژی چوار شەممە بۆ شاری نەجەفی ئەشرەف لە ناو هەزارەها جەماوەری هاوولاتیان كە لە مەیدانی ئمام علی لە شاری نەجەفی ئەشرەفدا كۆ بوو بوونەوە لە وتارەكەیدا وتی .. مێژوو سەر لە نوێ دووبارە دێتەوە بۆ ئەوەی ژیانەوەی ئەو پەیامی مسولمانەتی یە بگێڕنەوە كە باوپامیرانی عەرەبتان هەڵی گرتبو بە شێوەیەكی نوێ كە تەعبیر لە ژیانی بكات .**

**ئەمەش تەواوی وتارەكەی بەڕێز سەرۆكە :**

ئەی برایان ڕۆڵەكانی شارە خاوێنە پیرۆزەكە بە درێژایی مێژووی كۆن شاری نەجەف ..

ئەی برایان ڕۆڵە ئازادەكانی نەجەف ، بە ناوی سەركردایەتی حزبو بە ناوی ئەنجومەنی سەركردایەتی شۆرشەوە سلاوتان لێ دەكەم سلاو لە تێكۆشانتان دەكەم.. جاران ئەم شارەتان .. دەڵێن جاران شارەكەتان لە كۆندا هەروەك ئێستا گەورەترین نیشانەی مێژووی تێكۆشانی مسولمانەتیو عەرەبی هەڵگرتووە ئەویش باپیرمان ئیمام «علی»یە خوای لێ ڕازی بێت ، حەقی خۆمانە كە هەموومان دووجار شانازی بە ئیمام علی باپیرمانەوە بكەین جارێك لەبەر ئەوەی دیار ترین سەركردەی مسولمانان بووەو كوڕی مامی پیغەمبەری گەورەی كائیناتە ، وەجارێكی تر لە بەر ئەوەی عەرەبەو لەبەر ئەوەی لەم شارە عەرەبی یە خاوێنەدایە ، بەر لە هەزارو ٤٠٠ سال باپیرانی عەرەبتان لە زەویدا پەیامی ئاسمانیان هەڵگرت بۆ ئەوەی بیگەیەننە دوورترین شوێن لە ئەرزا ، مێژوو دووبارە دێتەوە بۆ ئەوەی ئەو پەیامی مسولمانیەتی یە ببوژێننەوە كە باپیرانی عەرەبتان هەڵی گرتبوو ، بە شێوەیەكی نوێ كە تەعبیر لە بكات بەڵام بیروبا وەڕكانی لە ژیانی مرۆڤایەتی سەر زەویەوە وەر دەگرێت ، لە گیانی هەمان پەیام كە عەرەب هەڵیگرتبوو كە بەوە چاكترین شێوەی ئازایەتیو دلسۆزیو خۆ بەخت كردنیان دەنواند لە پێش هەزارو ٤٠٠ سال لەمەوبەردا .

خاكی عەرەب مەیدانی پەیامە ئاسمانێكان بووە وە ڕۆڵەكانیش هەروا بوون لە هەموویان دیارتر ئیمام علی یە خوای لێ ڕازی بێت .. ئا بەو جۆرە نەتەوەی عەرەبو خاكی عەرەب سەر لە نوێ ڕۆڵەی قارەمانو بە باوەڕی هێنایەوە گۆڕ بۆ ئەوەی پەیامی پیرۆزی مسولمانەتی بگەیەننە دوورترین شوێنی سەر ئەرز .

لەبەر ئەوە ئەی برایان حربەكەتان حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی هاتۆتە كایە .

رەجارێکی تر دەوری ئەوە دەکەوێتە ئەستۆی رۆڵەکانی عیراق‌و دەکەوێتە ئەستۆی رۆڵەکانی نەتەوەی عەرەبەوە کە تیمە ئاسمانێکانو تەعبیر لێ کردنی بە عەدالەتێکی پێویست لە ئەرزا بوژێننەوە لە رێگای بیروباوەڕی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستی‌یەوە کە لە تیمی ئاسمان‌و لە پەیامی مسولمانەتیەوە وەر گیراوە .

ئیستیعمار نایەوێت ئەو دەورە ببینن وەهێز زۆردارە جۆربەجۆرەکانی تریش نایەوێت ئەو دەورە ببینن لە بەر ئەوە دەبینین دژی حزبەکەتان لە هەموو شوێنەکانی سەر زەویدا . ئا بەو شێوەیە دەبینین کە ئیمپریالیزمی ئەمەریکا چۆی بە شۆڕشەکەتاندا هەڵنایەت لە عیراقدا لە سەر ئەم بنچینەیە گەورەکانی « البیت الابیض » ئەوە رادەگەیەنن کە عیراق سەربازی کوبایی تیادایە بەلام ئەوان بە چاکی راستی ئەوە دەزانن کە تەنیا سەربازێکی بێگانە. لە ناو خاکی عیراقدا نییە وەبە چاکی ئەو راستی‌یەدەزانن کە پیاوانی عیراق‌لەم مەیدانەدا بەر لە هەزارو ٤٠٠ ساڵ دژی زۆرداری وەستاون‌و بە سەربا سەرکەوتن لە رێگای پەیامەکەوە وەپیاوانی عەرەب کە دژی زۆرداری راوەستان لە رێگای پەیامی مسولمانەتیەوە بەر لە هەزارو ٤٠٠ ساڵ بە سەربا سەرکەوتوون توانای ئەوەیان هەیە کە بەرگری لە لەخاک‌و کەرامەت‌و بیروباوەڕیان بکەن بەبێ ئەوەی پەنا بۆ بێگانە بەرن . هەرچەندە دۆست بێت وە هەرچەندە دوور بێت وەیا رۆست .

ئەی برایان بە ناوی ئێوەوە بە ئیستیعمار دەڵێین لە هەموو جێگایەکدا وە بە ناوی ئێوەوە بە هێزی زۆرداری‌و شەرخوازو ئیستیغلال‌و چەوساندنەوە لە هەموو جێگایەکدا دەڵێین کە لە ئەمڕۆوە جێگایان لە عیراقدا نییە وەرۆڵەکانی عیراق گەورەی خاکی حزبانن وەلە بەردەمی ئێوەدا ئەوە رادەگەیەنین وەك حزبەکەتان ، یەکەم بەیاننامەیدا لە «١٧» تەمموزو « ٣٠ » تەمموزدا رایگەیاند ئێمە دەڵێین‌و جارێکی تر ئەوە رادەگەیەنین کە عیراق هی ئێوەو نەتەوەی عەرەبە وە جگە لە رۆڵەکانی نەتەوەی عەرەب‌و عیراق لە خاکی عیراقدا جێگای کەس نابێتەوە، وتەمان دووبارەی دەکەینەوە کە ئێمە هەمیشە سەربازێکی بە وەفاو تێکۆشەرین نەك تەنیا هەر لە مەیدانی عیراقدا بەلکو لە هەموو مەیدانەکانی نەتەوەی عەرەبدا وە لە هەر کوێیەکدا زۆر لێکردن هەبێ لەوێ دەدەین .

ئەی برایان لە هەموو جێگایەکدا بە شیری ئیمام علی سلاوی خوای لێ بێت وەبە شیری گەورەمان حسین خالدی کوری وەلید سەلاحەدینی ئەیوبی وبە شیری هەموو تێکۆشەرێکی عەرەب وەبەوەهەموو سەرکردەکانی مسولمانان لە سەر خاکی عەرەب ئەوانەی خۆیانی‌و توانای خۆیان ئەوەندە بەخشی کە خاکی عەرەب‌و پەیامەکەی شایستەیەتی لە ، زۆرلێکردن دەدەین ، وەئێمە زۆر دڵنیاین کە سەر دەکەوین چونکە ئێمە باوەڕمان بەخوا هەیە وە باوەڕمان بە ئێوەهەیە .

تکامان وایە سلاوەمان بگەیەنن بە هەموو مالیك‌و هەموو کارگەیەك‌و هەموو کێڵگەو قوتابخانەیەك .. بۆ پیرەمێردەکان‌و بۆ مندالە بچوکەکان .. کە سلاوی سەرکردایەتی مرب‌و ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕش بگەیەنن سلاوی خواتان لێ بێت .

# لەم ژمارەیەدا




رۆشـنـبـیـری نـــوێ

گۆڤارێکی گـشـتـی مانگانەیە

دەزگای رۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردی دەری دەکـات

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الكردية ـ ساحة الفلاح بغداد

تەلەفۆن : ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

سەرنووسەر

اسماعیل رسول

جێگری سەرنووسەر

فائق جمیل




# رۆشنبیری نوێ لە کاروانی ئەسەروەتی خزمەت کردن و پێشکەوتندا

شەش سال لـــە مەوبەر لـــە پایزی تشرینی دوهەمی ســـالی ١٩٧٣ « گوڤـــاری روشنبیری » یەکەمین ژمارەی بەناوی « سفره »وە لە ئاســـۆی بەرزی روشنبیری ســـەری دەرهینـــاو وەکـــو دەستکەوتیکـــی بەنـــرخ کەوتـــە بازاری گەرمـــی جوولانەوەی روشنبیری کوردەوە وەشان بەشـــانی روژنامەو گوڤارە کوردیەکانی تر بانگی خزمەت کردنو دارشتنی ووشەی دلسوزووتەی جوانـــی پیرۆزی کوردی راهێشت ، کـــەوتە مەیدانـــی خەباتـــی روشنبیریەوە تاخشتی دانی لە کولەکەی کوشـــکی بەرزی رۆشنبیری‌دا .

چاو گێران بەم رێڕەوی کاروانی خزمـــەت کردنی ئەم گوڤارەدا ئەوەمان ئەخاتەوە یاد کـــەئەم گۆڤارە گورانیەکی هەمیشەیی بەخویەوە دیوە ....

به چەشنە هەلبەزو دابەزیکدا رویشتوە تا گە یشتوە رادەی ئەمرۆ پلەی پیشکەوتنی ئیستای ، لە هەول کودا لە قەبارەیەکی بیچوکی چواریەکی روژنامەیەکدا بەلیترپریس چاپ ئەکرا ئەکەوتە بەردەستی خویندەواران . بە بابەت وبەژمارەکەم تا بەکردەو کوششی بی هەوتای دەستەی نوسەران بەپشت گیری روشنبیران وەیارمەتی دانی دەولەتو شورش کەوتە گاگولکی ملی هەورازی سەرکەوتنی گرت ناوی دەرکرد جیگاو پایەی دیاری کراوی خۆی کردەوە لە ریزی چاپەمەنیەکانی کوردیدا وەبو بە ئەستیرەیەکی جربوە داری گەش لە ئاسمانی شینی بەختیاری روشنبیریدا .

لە هەول کوودا ژمارەی سفر بە هەشت لاپەرە دەرئەچو وتەنها دوو هەزار دانەشی لی چاپ ئەکرا بەلام خۆی لەم پلەیەدا نەگرت بەرەبەرە کەوتە پەلوپۆ هاویشتن هنگاونان بۆ پیشەوە سال لە دوای سال سەرکەوتنی بەدەست ئەهیناو کەندو کۆسپی ریگای پیش‌کەوتنی تەخت ئەکرد ... ئەوە بو لە دوانزە لاپەرەوە بو بە ۳۲ لاپەرەو . ئەمرۆ لاپەراکانی ئەگاتە ۸۲ دەلە دو هەزار دانەوە بو بەسی هەزار وشەش هەزارو و ۸ هەزار دە هەزار ئەمرو چواردە هەزار دانەی لی دەر ئەچی بە هەمو کونو قوژبنیکی ولاتدا بلاو ئەبیتەوە ئەکەویتە دەستی خویندەواران چی لە ناو ولاتدا یا لە دەرەوەی ولات ، بەم چەشنە ئەم گوفارە لەگەل هاولەکانی تریا بەیان ، هاوکاری بی وچان لە هەولو کوشش هنگاونان دایە بۆ بەرز کردنەوەی پلەی رۆشنبیری کورد . بلاوکردنەوەی ئەدبیاتی بیگانە ، زیندو کردنەوەی ناوی کە لە پیاو شاعرو ئەدیبەکانی کورد ، وەدەرخستنی ئەو سەرکەوتنو دەستکەوتانەی کە شورشی ۱۷ ـ ۳۰ تموز لەسەر کردایەتی حیزبی بەعسی عەرەبی سوشیالستی لە عیراقی شورشدا پیکی هیناو ... وا شەش سالی رەبەق تێ ئەبری وەئەم گوفارە پی ئەنیتە سالی حەوتەوە ... دەبا سالی ئەم سال بکەین بە سالی سەرکەوتن گەشەکردنو هەلمەت بردن بو پەرەپیدان بە رۆشنبیری وپیش‌خستنی تا گوفارەکەتان زیاتر بدروشیتەوە لە ئاسمانی ئەدەبی کوردیدا وببیتە مایەی شاناز بو بەرزی بو هەمو روشنبیران

ئەوەی شیاوی باسە روشنبیری نۆی ، بە خامەی رەنگینو بەبیری والابیژو ، کردەو کوششی تیکرا روشنبیرانی کورد . نۆی ئەبیتەوە دەولەمەند ئەبتو رازاو ئەبیتەوە بویە تاسەر لەنووی داوا لە روشنبیران ئەکەین کە گوفارەکەیان بەهی خویان بزانن وەبو رازاندنەوەی بە بابەتی جوانو دلگیر ، بەدەولەمەند کردنی . بە میژوو کەلەپوری کوردی ، دریغی نەکەن..چونکە هەمو کەمو کوریەکی گوفارەکە هەر ئەوان لی بەر پرسیارن

سلاوی گەرم بو دەستەی نوسەرانی روشنبیری هەر لە یەکەمین روژی هەتا ئەمرۆ

سەلاوی گەرم بۆ هەمو روشنبیرانی کورد کە هەمیشە بە تەنگ ئەم گوفارەوە هاتوون ونەیان هیشتوە کەمو کوری بچیزی سلاوی گەرممان بۆ هەمو خویندەوارانی کورد کەبەدلو بەگیان پشت گیریان کردیون ، وەمایەی سەر بەرز بۆ پێشکەوتنی گوفارەکەمان بوون ...

« روشنبیری نوێ »

# بیرەوەری شەش ساڵەی

لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٣ دا کە چوومە « بەڕێوەبەریتیی ڕۆشنبیریی گشتی » هەستم بەوە کرد کە گەلێ کاروباری پیویستیو بەکەڵك کەوتۆتە سەر شانی ئەم بەڕێوەبەریتییە لە مەیدانی بووژانەوەی ئەدەبو میراتی نەتەوەیی‌مانا ، بێ ئەوەی ئەو هەنگاوانەی پێویستە بنرین لەم مەیدانەدا بە تەواوی نرابن ، بە تایبەتی لە مەیدانی ڕێك خستنو بڵاو بوونەوەی چاپەمەنی‌دا ، هەستمان بە بۆشایی‌یەکی گەورە ئەکرد .

لەو سەردەمەدا : ڕۆژنامەی هاوکاری « و گۆڤاری « بەیان » لە وەزارەتی ڕاگەیاندن دەر ئەچوون ، جگە لە ڕۆژ نامەی «برایەتی» و «بیری‌نوێ» گۆڤاری « نووسەری کورد » و « ڕۆژی کوردستان »و ڕۆژنامەی « ژین » لە سلیمانی . من هەستم ئەکرد کە ئەم ڕۆژنامەو گۆڤارانە کەلێنێکی باشیان پڕ کردۆتەوە بۆ بوژاندنەوە وخزمەت گوزاری ڕۆشنبیریو میراتو ئەدەبی کوردی ، بەڵام هەریەکەیان بەپێی ئەو ڕێبازو ئامانجە تایبەتیو گشتی‌یەی خۆی هەیەتی یان بۆیان دانراوە خزمەت ئەکات، هەر یەکەیان لەم هێڵە گشتی‌یەی بۆی دانراوە ناتوانی بچێتە دەرێ، لەبەر ئەوە بەشێکی بەجێ لە نووسەرانو شاعیرە کوردەکان ، بەتایبەتی لە ناو کۆمەڵی لاواندا هەستیان بە جۆرە مەغدور بوونێك ئەکرد وەزۆر جار سکاڵایان لە نەبوونی سەربەست بڵاوکردنەوە ئەکرد ، جگە لەوەی زۆر جار لەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا سیاسەتی (ئەمە لە خۆمانە) و (فلان نووسینەکەی بڵاو مەکەنەوە) و ( خاتر خاترێنە ) و ( گەڕەك گەڕەکینەی ) قەڵەمو نووسیی ئەکرا . ناوی خاوەنەکەی مەترو نێویك بوو ، لەو لایەوە نووستینی کە ناوی خاوەنەکەی بە میکروسکوبیش نە ئەخوێنرایەوە، کە ئەمە گەورەترین تاوانێك بوو ئەکرا بەرامبەر یەکسانیو دیموکراسی کردنی هەقی نووسینو بڵاوکردنەوە . ئەو مەیلو ئارەزوویەی هەبوو بۆ نووسینی بەرهەمی تازە بابەتو نوێ خوازی لە هونەرو ئەدەبدا بەو شێوەیەی پێویست بوو پەیرەوی بکرێ لەم ڕۆژنامەو گۆڤارانەدا بەدی نەئەکرا ، زۆر جار ئارەزووی یەکتەنی تاقە کەسێك سەر پشكو پێوانە بوو بۆ بڵاوکردنەوەو بایەخ دان بە وتارو شیعرو لێکۆڵینەوە ئەدەبی‌کان . جا لەبەر ئەم هۆیانە هەست بەوە ئەکرا کە ئەگەرچی ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردی بەپێی ئەو سەردەم ڕۆژە کەم نی‌یە ، بەڵام هێشتا وەکو گەلێ ئەرکو بابەتی جێ بەجێ نەکراو هەیە کە پێویستی‌یان بە دۆزینەوەو دەربڕینو بڵاوکردنەوەیە .

ئەوە بوو لەسەرەتای مانگی تشرین یەکەمدا داخوازی یەکمان پێشکەش کرد بەوەزیری ڕاگەیاندن مامۆستا حامید جبوری . داخوازی کەمان تەنها بۆ دەرکردنی بڵاوکراوەیە بوو ، نەك لە شێوەی ڕۆژنامەو گۆڤارا ، چونکە داواکردنی دەر چوونی گۆڤارێکی نوێی کوردی یان ڕۆژنامەیەکی تازە ، پێویستی بە وەختێکی دورو درێژو موافقەت کردنی چەند دەسەڵاتێکی بەرزتر لە دەسەڵاتی وەزیر بوو . لەپاش ماوەیەکی کورت وەزیری ڕاگەیاندن قایل بوونی خۆی بە دەرکردنی بڵاوکراوەیەکی کوردیو عەرەبی لە قەبارەی ڕۆژنامەیەك بچوکو گەیاندبە بەڕێوە بەرێتی ڕۆژشنبیریی گشتی .

ژمارە سفری ئەم ڕۆژنامەیە بەناوی « ڕۆژشنبیری‌نوێ »وە ڕۆژی ١١-١١-١٩٧٣ دەرچو . هەر لە یەکەم ژمارەی ئەم بڵاوکراوەیەوە ڕەچاوی ئەم بنکانەی خوارەمان کرد !

یەکەم : سەربەستی بلرێ بە هەر نووسینێکی پێشکەوتوخواز پلەی هەنەریو زمانەوانی ڕێك‌وپێك بێت بێ ئەمەی سەیری تەمەنو ناو بانگ خاوەنە کەی بکرێت .

دووەم : دروشمی بڵاوکراوەکە نوێ خواز بوو . ئامۆژگاری بۆ نووسەران بریتی بوو لە « وا بنووسە کەس لەمەوبەر نەی نووسیبی ، بۆ بابەتی وا بچۆ کەس لەمەوبەر بۆی نەچووبێ » .

سێهەم : لە سنووری توانتی ئەم بڵاوکراوە

# رۆشنبیری نوێ

د . احسان فواد

بچووکەدا بایەخێکی بەجێ درابوو بە روخساری تەکنیکی رۆژ نامەکە . لە دابەش کردنی بابەتەکانیا ، لەخەت و رازانەوەو رەنگ کردنیا ، لەقەبارەو بابەتەکانیا ، هەول ئەدرا سەرنج راکێش و پوخت و سفت و سۆل بێ ، دیارە ئەم ئەرکەش سەرمایەکەی تەنها دلسوزیی کادرەکان بوو،ئەگینا لە باری نەبوونی دەزگایەکی تایبەتی کوردی بۆ چاپ کردن ، نە بوونی کرێکاری هونەروەر (فەنی) ئەم رێك و پێکییە زۆر زەحمەتە بێتە دێ .

چوارەم : بۆ هاندانی نووسەران و ئەدیبان و شاعیرانی لاو ، بۆ هەر نووسینی ، پارەیەکی تەرخان کراو دانرا . لەم مەیدانەدا وەکو رۆژنامەیە ، یان بلاوکراوەیە « رۆشنبیری نوی » رەچەی شکاندو دەوری یەکەمی بینی ، چونکە لەمەوبەو بۆ نووسینی رۆژنامە ، ( موکافەئە ) تەرخان نەئەکرا .

پنجەم : بلاوکراوەکە هەولی ئەدا ئاورێکی راستەقینە لە هونەری کوردی هونەرمەندانی کورد بداتەوە . لە سنووری ئەو چەند لاپەرە کەمەدا ، و بەو قەبارەیە . لە هەر ژمارەیەکدا گوشەیەکی تایبەتی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کردبوو . شەشەم : لە دەست پێ کردنی‌وە تاژمارە (٤١) ، ئەوەندەی من بیتەوە بیرم و ئاگاداری بم ، ئەو کۆمەلە کادرە کەمەی لەمیدانی نووسیی و سەرپەرشتی و تەلون و جێ‌بەجێ کردنی ، کارەکانی کەدا ، شەش ـ حەوت لاوی دلسور هونەریکی گەورەیان سپێرا ، کە شەویان تیایا ئەخستە سەر رۆژ ، تا درەنگ وەختێ شەوگار لە ( چاپخانەی زەماندا ئەمانەوە ) . خوا هەلناگرێ . کرێکارانی ئەو چاپانەیە لە ئێمە زیاتر بە پەرۆش بوون رۆژنامەکە لەکاتی خۆیداو بە باشترین روخسار دەربچێت ، راستی کۆمەلەکەی « ابو اياد » و « جورج » وەکو کرێکار بۆ ئەم رۆژنامەیە ئیشیان نەئەکرد ، بەلکو وەك کۆمەلی برادەری دلسوزو شارەزاو لێ بوردوو هاتنە پێشەوە. زۆر جار کاتی ئیش کردنیان ئەبرایەوە کە چی هەر بەردەوام ئەبوون ، تا ژمارەکە لەکاتێ خۆیدا دەرچوایە بۆیە زۆر جار لە یەکی مانگاو پانزەی مانگاو بیست و یەکی مانگدا، (رۆشنبیری نوێ) ئەکەوتە بازاری چاپەمەنی کوردی‌وە . ئەمە یەکێ بوو لەو هۆیانەی بلاوکراوەکەی سەنیکترو خوشەویستی کرد لەلای خۆێندەواران .

ئەو کادیرانەی هەر لەسەرەتاوە هەموو توانستی خۆیان لێ خستە کار بۆ ئەم بلاوکراوەیە ( حوسێن عارف ) وەك نووسەرێك ، ( محمدزادە ) وەك خەت نووسیی هونەرمەند ، ( سمکۆ توفیق ) وەك نیگار کێشێکی لاوی خوێن گەرم ، ( ئەنور محمد ) ( جعفر بەرزنجی ) وصلاح شوان وەك هاتو چوکەرو جێ‌بەجێ کەری دەرکردن لە چاپخانەکە ، ( محمود زامدار ) وەك نووسەرێکی بزوزو بەتام و پێز ، دەورێکی باشیان نوواند لە سەرکەوتنی ژمارەکانی یەکەمی ئەم بلاوکراوەیە .

لە ژمارە (٢١) بەولاوە ، محمد امین هەورامی فوزي رفيق حلمي ، بەشداری هێندی کارو باری بلاوکراوەکە بوون ، ئەمە جگە لەوەی نووسەرانەو هونەرمەندانی دەرەوەش ، ( دەرەوەی بە د بەرێوە بەریەتیەکە ) هاوبەشی‌یەکی گەرمیان ئەکرد لەنوسین و ئامۆژگاری کردندا .

زۆر هۆ هەن کەمایەی سەرکەوتنی رۆژنامەیە یان گۆڤاریکی ، بەلای منەوە بلاوکراوەی (رۆشنبیری نوێ) ئەگەر لە ژمارەکانی یەکەمیا سەر کەوتو بووبێ ، لە هەموو هۆیەکان زیاتر کە مایەی گەشەداری بووبن ، دلسوزی و گونجانو لە خۆوردنی کادیرەکانی بوون ، کە کامەکەیان بە بێکار سەیر نەئەکرد ، بەلکو ئیش کردنو کار کردنیان کردبووە جۆرە ئاهەنگێکی برایانە ، کە هەرگیز وزەی لێ نەئەبڕین ، بەلکو ماندوو بوونێ لێ کردبوون بە وەخت و سەردەمێکی بە پێزو تام کە حەزیان ئەکرد درێژەی بکێشایە وەك خوێندنەوەی رۆمانێکی سەرکەوتوو کە پیاو لە خویندنەوەی هەرگیز تاقەتی ناچێ .




# ژمارە (١) ی رۆشنبیری نوێ

ئەم ژمارەیە کە ئەستێرەیەکی تربوو لە دنیای ڕۆژنامەگەری کوردیدا درەوشایەوە لە ١١-١١-١٩٧٣دا لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری کوردی بەهەشت لاپەڕەی قەوارەی بچووک - بەقەد نیوەی لاپەڕەی رۆژنامە - بە کوردیو عەرەبی دەردەچوو ..

لاپەڕەی یەکەمی لە سەرووی سەرەوەی لە لاکێشێکدا نووسراوە ئەم ژمارەیە دیارەو مانشێتەکەی بەخەتێکی سوور مزگێنی سازکردنی میهرەجانێکی گەورە بۆ هونەری کوردی بلاوکردۆتەوەو ئینجا وتەی ژمارە لەلای راستی لاپەڕەکەدا لەسەر دوو ئەستوون هەتا بنی لاپەرەکە هاتۆتە خوارەوەو لە برگەیەکیدا وا نووسراوە [ لە پچر پچڕیو نەبوونی دەستەیەکی رۆشنبیری چالاکو سنگ فراوان نەبوونی پالپشتێکی مادیو مەعنەویو ، نەبوونی توانستێکی چاپەمەنیو تەکنیکی نوێو دەیەها هۆی کە .. ئەمانە هەمووی لە گولشەنی پاڕو بەرینی ئەم پەیامە پیرۆزەدا ریسەکەی کردووین بە خوریو گەای رەنجی بەباداوین کە لام وایە بێ روالەت ، هەموو خوێندەوارێکی دلسۆزو چالاك هەست بە زیانەکانی ئەکات ... هتد ] لە ناوەڕاستی هەمان لاپەڕەدا بانگەوازێکی دەستەی نووسەرانی بۆ گشت ئەدیبو نووسەرانیکورد بلاوکراوەتەوەو لەلای چەپی لاپەڕەکەش وێنەی وزیری راگەیاندن مامۆستا حامد جبوری وەزیری ئەوسای وەزارەتی راگەیاندن کە بەرێوەبەرایەتییەکە بەوەوە بەسترابوو بلاویکردۆتەوە .. دەبێ ئەوشمان لەبیر نەچێ کە لە قوژبنی چەپی لاپەڕەکەو لەسەرەوە نووسراوە [بلاوکراوەیەکی رۆشنبیرییە ناو بە ناو دەردەچێت] .

لاپەڕەی دووەمی بەمانشێتێکی زلو زەبەنگ نووسراوە [ « شێر پەنجە » بە ئەمەیا شیعرە ] کاك محمود زامدار وتارێکی دووردرێژی لەسەر شیعری نوێی کوردیو گیروگرفتەکانی نووسیوە .. هەر لە هەمان لاپەڕەدا دوو پارچە شیعر بلاوکراوەتەوە یەکێکیان هی دلشادمەریوانییەو لە ژێر ناونیشانی ئەرتەنمو ئەویتریان هی حەسیب قەرەداغییەو بەناونیشانی جەژنانە .. هەروەها لە سووچێکی تری ئەو لاپەڕەیەدا دەمەتەیەکی دوومندالی کورد لە ژێر ناونیشانی گوڵ ئەستێرە بلاوکراوەتەوە . لاپەڕەی سێهەم تەنیا یەك وتاری تیا بلاوکراوەتەوە ئەویش لە ژێر ناونیشانی « لە دادگای ئەدەبدا » کە زنجیرەی یەکەمی چەند وتارێکە لەسەر بارودۆخی ئەدەبو ئەدیبی کوردا نووسراوە .. لە هەمان کاتدا وێنەیەکی ( تخطیطی ) بە پەرەمووچی هونەروەند سمکوتۆفیق بۆدادگاکەو بەشداربکەران لە سووچی سەرەوەیدا بلاوکراوەتەوە وێنەی کاربەدەستانی یەکێتیو دوو پۆلیسو تاوانبارو بەشدارانی دادگاکە نیشاندەدات .. وتارەکە لەسەر چۆنەتی بەکێشکردنو موحاکەمەی کردنی تاوانبارەحێ . عەین . بێ ـ نووسراوە بێ ئەوەی ناوی خاوەنی وتار نووسەکە لەسەری دیارکرابێت ..

لە لاپەڕەی چوارەمدا هەمان وتاری وەزیری راگەندن بە عەرەبی بلاوکراوەتەوە .. دیسان هەر لەو لاپەڕەیەدا کە لە بنەڕەتدا عەرەبییە وتارێك بە ناونیشانی ( کلمه ) بێ ئەوەی ناوی نووسەرەکەی لەسەربێت هەیەو وتارێکی زمانەوانی دەربارەی رێزمانیکوردی لە ژێر ناونیشانی ( اللغه الكردیه الحدیثه ) کە دوکتۆر پاکیزە رەفیق حلمی نووسیویەتی بلاوکراوەتەوە ..

لە لاپەڕەی پێنجەمدا کە ئەویش لاپەڕەیەکی عەرەبییە دوو پارچە شیعری کوردی کراوە بەعەرەبی یەکێکیان هی مەولەوییەو لە ژێر ناونیشانی ( ریح الصبا ) لەلایەن محمدیملاکەریمو ئەویتریان هی سعداللەپەرۆشەو لە لایەن حسین عارف لە ژێر ناونیشانی ( بدایة حکایەتی اللامتناهیة ) کراوە بە عەرەبی .. هەروەها پارچە شیعرێکی عبد الوهاب البیاتی شاعیر بە ناونیشانی ( الرحیل الی مدن العشق ) و لەگەڵ نووسینکی شاملمردان لە شێوەی بیرێکی راگوزاری .

لە لاپەڕە شەشی ژمارەکە وتارێك لە ژێر ناونیشانی لێکۆلینەوەی بەراوردی بەناوی محمد امین هەورامانیو وتارێکیتر لەژێر ناونیشانی لیستەی کتێبە کوردییەکانی سالی ١٩٧١ بلاوکراوەتەوە .. لاپەڕە حەوتی ژمارەکە وەکو هەموو رۆژنامەیەك پاشماوەی وتارەکانی تیایە . دوا لاپەرەی بریتییە لە بەرهەمی هەمە رەنگو بەشێوەیەکی جوان رەنگرێژکراوە.. لاپەڕەکە پارچە شیعرێکی ئەژیگۆران لەژێر ناونیشانی دەنگوباسێك بۆ مۆزامبیقو بیرێکی راگوزاری بە ناوی نەخۆشییەك لەلایەن محمد صالح سعید نووسراوە تیایەتی .. هەروەها خوشکە ( خەرامان فؤاد مەستی ) یش وتارێکی دوورو درێژ لە ژێر ناونیشانی منو شەیتانەکان لە هەمان لاپەڕەدا نووسیوە .. خوێنەری خۆشەویست .. ئەمانە ئەو وتارو بابەتو لێکۆلینەوە جۆر بەجۆرانەبوون کە لە ژمارە سفری رۆشنبیری نوێدا بلاوکرابوونەوە .

**● زادوق آدم ●**




# حیکایەتی دەرکردنی ژمارە (٠- سفر) ی گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)

شەش سالو (٧٨) ژمارە .. واتە هەر سالەو سیانزە ژمارە ! . ئەمە چۆن چۆنی‌یە ؟! . ئێمە ئێستا گوڤارەکە وەها دەناسین کە مانگانەیە . ئێ باشە ، سالیش وەك هەموو دەزانین دوازدە مانگە . کەچی ئەوتا دەبینین سالی سیانزە ژمارەی بە موعەدەل لێدەرچووە ! . دەیا ئەمە ئەبێ چی بێ ؟! . تۆ بلێی مەتەلێك‌بێ ؟! . بێگومان نەء . بەلکوو مەسەلە زۆر ئاسایی‌یەو تەنیا هێندە هەیە کە حیکایەتێکی لە پشتەوەیەو منیش لێرەدا تەقەلای ئەوە دەدەم ئەو حیکایەتەتان بۆ بگێڕمەوە .

**حیکایەتەکە**

حیکایەتەکە دەلێ :

هەبوو نەبوو کۆمەلە گەنجێکی دێوانەو عاشقی وشەی کوردی هەبوون . ئەم کۆمەلە گەنجە ، پێچ و خولی ڕۆژگار لە دەورانێکدا ، لە دەزگایەکی ڕۆشنبیری‌ی میریدا پێکەوە کۆی کردنەوە . وەهاش هەلکەوتبوو کە مەسئوولی‌یەتی بەرێوەبردنی دەزگاکە لەو دەورانەدا ، بەیەکێ لە کۆمەلە گەنجەکە خۆیان سپێردرابوو ، کە لە ڕاستیدا ئەو ، زەمانێك بوو کە شکۆلی دێوانەیی ئەو عەشقەی هەلگرتبوو .

ڕۆژێکیان گەنجی بەرێوەبەر بەوانی تری وت :

— ئەرێ ئێمە بۆ شتێك نەکەین ؟ .

وتیان :

— چی ؟! .

وتی :

— چرایەکی‌تر هەلکەین

ئەوان هەموو بەیەك [illegible] وتیان :

— هانامان‌کردە دەمت .. دەس لە دەس‌و قوەت لە خوا .. لەگەلتدابۆی دەبینە پەروانە .

گەنجی بەرێوەبەر بۆ ڕۆژی دوایی بەوانی وت :

— وا داوام‌کرد .

ئەوان دوای چەند ڕۆژێك لەویان پرسی :

— بەچی گەیشت ؟! .

# حسین عارف

ئەو رۆژێکیان بانگی‌کردن‌و وتی :

— دەی ! .... چراکە هەلکەن .

ئیتر کۆمەلە گەنجەکە بوونە کوورە هەنگێك .

سەرەتا کەوتنە راوێژکردن :

- چ ناوێکی لێ‌بنرێ ؟ .
- قەوارەی چۆن بێ ؟ .
- چەند لاپەرە بێ ؟ .
- جۆری نووسینەکان چی‌بێ ؟ .
- کاروباری بەرێوەبردنی چۆن بێ ؟ .
- دواجار لەکەیدا یەکەم ژمارەی لێدەربکرێ‌و هەر ژمارەیەشی بەچەند رۆژ جارێك‌بێ ؟ ! .

بۆ ئەمەیان گەنجی بەرێوەبەر دەسپێشکەری‌ی کردو وتی :

ـ من وای بەچاك دەزانم کە یەکەم ژمارەی لە رۆژی ١١ـ١١ـ١٩٧٣ دا لێدەربکرێ‌و ژمارە ( ٠ ـ صفر ) یشی لەسەر دابنرێ‌و لەسەریشی بنووسرێ ( ئەم ژمارەیە دیاری‌یە ) ، تا وەك نۆبەرەیەك پێشکەشی خوێنەرێ ئازیزی کوردی بکەین .

کەنجەکانی‌تر هەموو لە دلدا بۆیاندا لەهارەی چەپلەو پێشنیارەکە بە شادمانی‌یەوە پەسند کرا .

ئیتر دوای ئەوی ناویش لێ‌نراو قەوارەو ژمارەی‌لاپەرەکان‌و جۆری نووسینەکانیشی دەسنیشان کران ، کاروباری بەرێوەبردنیشی بەبێ دابەش‌کردنی رەسمی ، واتە بە بێ رەسمی‌یات ، هەر لەخۆیەوە بەم جۆرە کەوتەوە :

- دوکتۆر احسان فؤاد

— سەرنووسەر .

- حسین عارف

— سکرتێری نووسین .

- محمد عثمان عزیز زادە

— خۆش‌نووس‌و نەخشەکێش .

- سمکو توفیق

— وێنەکێش .

- انور محمود

— نەخشەساز .

- صلاح شوان

— راستکەرەوەوەی هەلەی‌چاپ .

- جعفر بەرزنجی

— راستکەرەوەی هەلەی‌چاپ .

بێگومان ئەگەر بگەڕێتەوە سەر ژمارە (٧) و چاوێك بە لاپەرەکانیدا بخشێنیت ، ناوەڕاستی تەرەفی لای راستی لاپەرە (١٢)یدا ئەو ناوانەت بەرچاو دەکەوێ کە وەك ئاگاداری‌یەك لەبەر خاتری مێژوو نووسراوەو بۆ خۆرزگارکردن بووە لە گلەیی مێژوونووسان لە دوارۆژدا . دەنا کۆمەلە گەنجەکە خۆیان‌بوو جوونەیەك دل‌و یەك‌گیان‌و یەك‌سەرویەك دەست‌و پیکەوە دەبزوتن‌و هەلدەسووڕان‌و کارەکەیان سازدەداو چراکەیان هەلدەکرد ، ئەگەرچی هەریەکەشیان شانی‌نابووە ژێر لایەکی بارەکەو ئەرکێکی تایبەتی بەجێ دەهێنا کە بەوانی تر نەدەکرا. نهێنی‌یەکە کوت‌ومت لێرەدابوو . دوکتۆر احسان سەرنوسەرەو دەزانێ کە سەرنووسەرە . بەلام دەشزانێ کە سمکو توفیق وێنەکێشە نەك خۆی . یا حسین عارف سکرتێری نووسینەو دەزانێ کە سکرتێری نووسینە . بەلام دەشزانێ کە محمد زادە خۆش‌نووس‌و نەخشەکێشە نەك خۆی . هەروەها بەدەمی‌یەوە بۆ نەخشەسازو راستکەرەوەی هەلەی چاپیش . ئینجا با ئەوەش بلێم کە لە بەرامبەری ئەم گیانی رێزلێنانەدا بۆ سەربەخۆیی‌و سەربەستی هەریەکە لەو حەوت گەنجە لە ناو خۆیاندا بۆ ئەو ئەرکەی هەر یەکەیان بەجێ‌ی دێنێ ، زۆریش ئاسایی‌بوو کە صلاح بە دوکتۆر بلێ ئەو نووسینە وەهایەو وەهانی‌یە . یا سمکو بەزادە بلێ ئەو خەتە ئەبوایە وەهابووایەو وەها نەبووایە . یا انور بە سمکو بلێ ئەم وێنەیە دەبێ وەهابێ‌و وەها نەبێ .

کۆمەلە گەنجێکی لە کەلەموستی پێوە تاتەوقی سەر پڕ لە حوماس‌و خۆشەویستی‌و دلسۆزی بۆ

وشەی کوردی .. بۆ رۆشنبیری‌و ئەدەبی‌و هونەری کوردی .. کۆمەڵە گەنجێکی هێند گونجاو هێند هوگری ئیشەکەو هێندەش سەر بە رێزلێنانی پەیوەندی هاورێیەتی‌و دۆستایەتی لەگەڵ یەکتردا .. حالەتێکی دەگمەنەو بۆ هەلکردنی چرای ئەم ( رۆشنبیری نوێ ) یە هەلکەوت .

بەهەرحاڵ با بگەڕێینەوە سەر گێڕانەوەی ئەسلی حیکایەتەکەو بزانین ژمارە ( . ـ صفر ) ی ئەم گوڤارە چۆن دەرچوو .

ئێستا واچاپخانەی ( الزمان ) ئامادەو لە سەرپێیە . ( ادوارد ) نووکی پەنجەکانی هەردوو دەستی بە سەر پیتەکانی لاینۆکەوە راگیرکردوونو چاوەڕوانە. و(ابو اياد) دەستو مەچەکی بۆ رێکخستنی دێڕە قورقوشمەکان حازرکردوون . ( ناجی ) لە خوارەوە لە پشت مێزەکەیەوە چاوی بڕیوەتە دەرگا . پێش تۆزێ تەلەفۆنی بۆ کرابوو کەوا کەوتە رێ . بەڵێ .. یەکەمین‌و شەو دێڕەکانی یەکەمین ژمارەی ئەم ( روشنبیر نوی ) یە ، بە سواری دولدولە (لاتفیا) خۆشەویست بەبن هەنگلی (جعفر)ەوە ، بەرەو چاپخانە بەڕێوەبوون . لە (مسبح)ەوە کەوتبووە رێ‌و شەقامی ( السعدون ) و ( الرشید ) ی تەی‌دەکردو رووەو مەیدانی ( المامون ) دەکشا .

گەیشتە جێ . جعفر بە خۆی‌و ئەمانەتە گرانبەهاکەی بن هەنگلی‌یەوە بە پرتاو خۆی‌کرد بە ژووردا . ناجی بەرزەپێ لە بەری هەڵسا . دوو قۆلی دوو دوو بە پێلیکانەکاندا سەرکەوتن . ئەمانە تەکەیان تەسلیم بە ( ادوارد ) کرد . پەنجەکانی ( ادوارد ) بەخێرایی کەوتنە جم‌وجووڵ . لاینۆکە زمانی لێ پەیدابوو :

ــ چــك .. چــك .. چچــك .. چك .. چچك ..

چك‌چکەکان دەیانوت : [ « رۆشنبیری نوێ » وەك دەنگی نەوەیەکی شۆڕشگێری نوێ ، ئەیەوێتو بەراستی مەبەستێتی لە سنووری توانستو پەیامی رۆشنبیری‌ی خۆیدا ، دەمتی هەموو نووسەرو شاعیرو ئەدیبێکی راستو دلسۆزو هەقپەرست بگرێت ] . هەروەها دەیوت : [ پێویستیش بەوە ناکات کە دووبارەی کەینەوە کە ئەم چەند لاپەڕەیە بە ئەوپەڕی رێزو قەدر گرتنەوەو بێ هیچ لایەنگیرییەکی تەسك‌بین، بە هەموو سەربەستی‌یەکەوەو بێ چاودێری‌کردنی جیاوازی‌ی بیروباوەڕی سیاسی‌و رێبازی ئەدەبی‌و کردنیان بە پێوانە لە هەڵبژاردن‌و بڵاوکردنەوەدا ، بەرهەمی هەموو خاوەن بەهرەیەك بڵاوئەکانەوە ] .

ئەمە بەمەرەکەبێکی سەوز لەسەر کاغەزێك کە بەچاپ لە قورنەی لای راستی بەشی سەرەوەیدا نووسرابوو ( مديرية الثقافة الكردية العامة ) بەخەتێکی ( شەڕە پشیلەیی‌یانە ) کە خەتی گەنجی بەڕێوەبەری‌گشتی‌و سەرنووسەر بوو ، نووسرابوو . ئەمەیەکەمین ( وتەی ژمارە ) ی یەکەمین ژمارەی ئەم رۆشنبیری نوێ‌یەبوو .

ئینجا ئیتر دەی کوڕگەل ئیش‌کەن .. دەی ئاو بوەستێ ئێوە مەوەستن . دەی (جعفر) تۆ بەردەوام‌بە سواری پشتی دولدولە لاتفیا لە نێوان دایەرەو چاپخانەدا ببەرە مەکۆی جۆلا . هەر (تەکنە) هەلگرەو دانێ‌و هەر پرۆ (تەکنە) هەلگرەو دانێ‌و هەر پرۆڤەیان لەسەر دەربێنەو هەر ( اعمده ) بۆ راستکردنەوەی هەڵەی چاپ بێنەوبەرە . دەی ( صلاح ) تۆش هەر ( اعمده ) بگرە ژێر دستو لەگەڵ ( جعفر ) دا هەڵە راستکەنەوە بەڵام تۆ (زاده) و ەرە بەو دەستو پەنجە رنگینانەت ، نەخشەی رازاوە بۆ لاپەڕەکان بکێشەو خەتی جوان بۆ ناونیشانەکان بنووسە . ئینجا تۆ ( سمکۆ ) وەرە یە بە هەرە گەشەکەت ، شوێن ( مۆنتیف ) ەکانی نەخشەکەی زادە بڕەنگێنە . خۆ تۆش ( انور ) دیارە لات ئاشکرایە کەدەبێ زادەی کۆششی هەموو ئەوانەی پێشوو ( لە دوکتۆر احسانەوە بۆ حسین عارفو بۆ صلاحو جعفرو بۆ زادەو سمکۆو لەگەڵیشیاندا هەموو ئەو ئەدیبو نووسەرانەی لە ژمارەکەدا بە نووسین

بەشدارن ) ، بەو پەڕی شارەزایی‌و وەستایی‌یەوە لە نەخشەسازیدا بنوێنیت . دەبێ کارێکی وەها بکەیت کە لەو نواندنەدا کەسێکیان لێت بە گلەیی نەبن ، یا هەر هیچ نەبێ گلەیی گەورەیان لێت نەبێ .

دەی کوڕگەل .. ئەمەیەکەمین ژمارەی مەلۆتکەیەکی نوێ‌یەو دەخرێتە کۆشی ڕۆژنامەگەری‌ی کوردی‌یەوە . تکایە بەلای ئەوەدا مەچن کە بلێن : ئەوە تا ژمارە ( . ـ صفر ) ی لێدراوەو ئەمەش مانای ئەوەیە کە ئێمە لە سفرەوە دەس پێدەکەین‌و دەس پێکردنیش لە سفرەوە مەغزاکەی ئاشکرایە!. نەخێر. گەنجی بەڕێوەبەرمان قەت مەبەسی لەوە نی‌یەو خۆی وەختێ ئەم پێشنیاری ژمارە سفرەی بۆکردین بەلای ئەوەدا نەچوو بوو . ئێمە هەموومان باشی دەناسین . کوایە ئەو لەوانەیە کە ڕۆژنامەی ( کوردستان ) ی ١٨٩٨ و گوڤاری ( گەلاوێژ ) ی ١٩٣٩ پەڕبکات‌و نیازی وابێ لەم ( ڕۆشنبیری نوێ ) یەوە دەس پێکرێ ؟ ! . هەرگیز نەء . . .

دەسا دەی کوڕگەل .. دەی سەربازە بێ ناوەکان .. ڕۆژێکەو ئەمڕۆ .. با ئێمەش دەستە گوڵی خۆمان‌و، وەك کۆمەڵەگەنجێکی عاشق‌و شەیدای وشەی کوردی‌ی شەرانەتمەندو سەرفراز، پێشکەش بە نەوەی ئێستاو نەوەکانی داهاتووی ئەم نەتەوەی کوردە بکەین .

ئەیسا .. ئێستا وا کات شەوی ( ١١/١٠ )ی مانگی (١١)ی سالی (١٩٧٣)یە . کۆمەڵە گەنجە ـ کوورە هەنگەکە هەموو ئالاونەتە چاپخانەی (الزمان) . چاپخانەی (الزمان) لەوە کەوتووە چاپخانەبێ . کوورەهەنگێکی پڕ لە هەنگ‌و هەنگوینە .

ـ چك .. چچك .. چك .. چچك ..

( هەنگ .... ) .

ـ تم .. ترم .. تم .. ترم ..

( هەنگوین .... ) .

هەنگەکان‌و هەنگوین .. گەنجی بەڕێوەبەرو گەنجەکانی‌ترو کارگەرانی چاپخانەکەوو مەکینەکان .. هەموو دەبزوین . هەموو دێن‌و دەچن‌و بەیەکدا دێن . هەمووش دەزانن کە کۆششی ئەوە دەکەن شانەیەك پڕ بکەن لە هەنگوین‌و بە دیاری بی نێرن بۆ کوڕو کاڵانی نەتەوەکەیان .

ـ چك .. چچك .. چك .. چچك ..

ـ تم .. ترم .. تم .. ترم ..

ـ چك .. چچك ..

ـ تم .. ترم ..

ـ چك ..

ـ ترم ..

تەواو ! .. لە چاپدانی ژمارەکە تەواو .. ئەوەتا بەدەستمانەوەیە : ـ

[ ڕۆشنبیری‌نوێ ـ ١١ـ١١ـ١٩٧٣ ـ ژمارە (٠) ]

ئینجا ئەم دیوو ئەو دیوی پێدەکەین . چاو بە لاپەڕەکانیدا دادەچەقێنین . تێی‌وردئەبینەوە . ڕاستە گەشکە دەمانگرێ . بەلام بە دەمی یەوە بەزەرەبین بە دوای هەڵەو چەوتی‌و کەم‌و کوڕی‌یەکانیدا دەگەڕێین .

لەو ساتانەدا من بە شێوەیەکی تایبەتی‌و بە ئەنقەست سەرنج لە ڕوخساری گەنجی بەڕێوە بەرگیر دەکەم . دەمەوێ ناخی بخوێنمەوە . دەیخوێنمەوە . دەبینم بەخوتێکی ( کوفی )ی جوان نووسراوە :

ـ دەك هەزار ڕەحمەت لە گیانی پاکت‌بشیر مشیر . وەی هەزار سوپاس‌و ستایشیش بۆ کەرامەتی نەمرت بشیر مشیر .

ئەمە حیکایەتی دەرکردنی ژمارە ( . ـ صفر )ی ئەم گوڤاری ( ڕۆشنبیری‌نوێ )یە بوو بڵاو کردن‌و ئیتر منیش هاتمەوەو لە بزەیەکی گەشکەداری‌ی سەر لێوان بەولاوە هیچی تریان نەدامێ .



# شەش مۆمی سەوزو... سۆزناك...!

شەش مۆمی سەوزو... سۆزناك...!

شەش مۆمی سەوزو... سۆزناك...!

شەش مۆمی سەوزو... سۆزناك...!

محمود زامدار

بیرێکی ڕاگوزەر بوو ، ماخولیایەڵبوو کەوتبوەنێوموغزەمانەوە ، لە وەختی کاک طلعت نادرا بڕیاردرا بەخشنامەیەکی هەفتانە دەربکرێ و تێیدا هەمو چوست و چالاکییە هونەری وئەدەبیەو ڕۆشنبیرییەکانی کوردی تۆمار بکرێت و بە چەند دانەیەك و بەئالەی طابعە چاپ بکرێت و لە نێو دایەرەکەی خۆمان دا بلاوی بکەینەوەو بۆ بەرنامەی ( دەنگی ڕۆشنبیری کوردی ) کە من و یەك دوو برادەری تر بۆ ئێزگە وتەلەفزیۆن ئامادەمان ئەکرد ، سودی لێوەرگیرێ و ئەگەر گرایش ولوا ، ئەوا چەند دانەیەکی بنێرین بۆ هەندێ دەزگای ڕۆشنبیری کوردی ...!! بیرێکی جوان وچکۆلەوفەریك بوو ، وەکو چۆن دایەرەکەشمان ئەوسانە فەریك بوو .. بەلام سەری نەگرت .... کە دکتۆری خەمسارد و خۆشەویستیش ( احسان فؤاد ) ئەرکی ئەو فەرمیکە دایەرەیەی خستەسەرشان ، هەمیس بیرەکەهەوی

**کردمەوە ، بەڵام کارەکە لای دکتۆر واکەوتەوە ، کـــە هەوڵێکی ( بەشیرانە ) ی بۆ بدرێ ، تائەو پەخشنامەیە بڕیارێکی وەزارەتی بۆ دەربچێ و بەهــەردو زمانـــی کوردی وعەرەبی،و لە حەفتەی جارێك ولەقەوارەی نیو رۆژنامەیی و بە هەشت لاپەرەدەربچێت ... بڕیارەکە پەسەندکرا ، پشت بە خواو .. برادەران کەوتنەکار ، پارەی بۆ تەرخانکراو چاپخانەشی بۆ دۆزرایەوە و ژمارەی ( هیچ ـ سفر ) ی لێهاتەکایەوە .. بوو بـە شاباڵۆغان و پیرۆزبایی ... تابلێی :**

**کۆرپەیەکی نوحپارەو خوێنشیرینبوو .. هەرلــەو ژمارەیەوە ، مزگێنــی سەرهەڵدانی رۆژنامەیەکـــی روحسوك لە نێوان ئـــەدیبو رۆشـــنبیرانی کوردا جاڕدرا..دەیان مرۆڤی دلسۆزهەمێزی میهروسۆزیان بۆ گرتەوەو دەس لـــە دەسۆکـــەو پشت بەکـــارو ماندوبوون و وشەی پالەو دلسۆزان ویەزدان .. !**

زمارە (١) یش لێ گەیشتەژێرچاپ ، زمـــارە دوایژمارە ، لەحەوت هەشت نۆ رۆژ جارێ ئەکەوتە بـــەر دەس ودڵ ودیـــدە عەودالەکانـــی وشـــەی پیرۆزیکوردی .. تاوای لێهات بە شێوەیەکی زۆر دڵڕفێنانەو لەمەودایەکی زۆر کورتـــا ، قـــەوارەو ناووشورەتو ناسنامەی خۆی بەتەواوی وەگیرهێنـــا وکەلێنێکی زۆر باشی لەواقیعی ئەدەبی و رۆشنبیری کوردیا گرتەوە .. تاژمارە (  )ی هەر هەشت لاپەڕە چکۆلانەکەبوو ، دوایئەم ودوای راوێژو لێکدانەوەیەکی ورد خرایە نێو قەوارەی گۆڤارێکەوە ...!! جـــاران پەخشنامەبوو ، بوو بە رۆژنامــــە ، رۆژنامەکــــەیش بوویەگۆڤار ..! ئۆخەی ..!

**تاژمارە (٤٥)ی هەر بە شێوەی گۆڤارێکی درێژ کۆلەی خنجیلانەی تێروتەسەڵ ـ لەبەڕێوەبەرایەتی گشتیی رۆشنبیری کوردی دەرئەچوو .. دوا بـــەد وای دکتور ، باری ( رۆشنبیری نوێ ) کەوتە دۆخێکی ترو قەوارەیەکـــی تـــر ..!! و دنیایەکی تـــرەوە دوا ژمارەی(٤٦) هەر لەو دەزگایە زۆر بەکزی و بەبێ ناز چاوی هەڵێنا ..! کاتێکیش کە دەزگاکەمان لەگـــەڵ دەزگای ( هاورکاری ) دا بووبەیەك .. (روشنبیری)یش لەگەڵ ئێمە مانان بارگەوبنـــەی لێك ناو هاتـــەلای دەستەخوشکی هـــەرە ئازیزی خـــۆی (بەیـــان)ی پرشنگدار .. ماوەیەك بێ دەرتان وکزولاوازبوو .. بەڵام هەر کۆڵی نەدا و وچانی نەگرت ، تابوە ئائـــەم ( روشنبیری ) یەی کە ئێستا لەبـــەردەس ولە نێو بیلبیلەی دڵان دایە ، بوو بەنیشانەیەکی هەرەدیاری**

نێو ژیانی ئەدەبی وفیکریو رۆژنامە کە ریمانو سەدان کەسیشەیدای لە دەورا کۆبونەوەو بەژانو فرمێسك و شەوەبخون پاراستیان ..!!

بەڕاستی : لەتـــەك ئەوەیش کـــە ئەم گۆڤارە ، پەخشنامەیە !! ، تا رۆژی ئەمڕۆ گەلێ ژان وژوری بە خۆی دیوە ، گەلێ تەگەرەو گەلێ مۆتەکەی سەیر سەیری لەبەردەما قوتکراوەتەوە ، بەڵام چونکە لەبنجا بەیامە پیرۆزەکەی خۆی بۆ خزمەتی ووشەی رەسەن وپـــاك ورەوانـــی کوردی تەرخانکردبـــو ، چونکە جکەرسۆزەکانی وازیان لێ نەهێناو لە نیوەی رێکادا هەناسەساردیان نەکرد ، چونکە نوسەرانی کـــورد ـ سەرباری هەموژان وهەژانێکیش ـ هەر لەدەوری ئالانو لە سەر برژانگ هەڵیان گرت .. (رۆشنبیری) بوە ، ئەم ( رۆشنبیری ) یـــەی کـــە ئەمڕۆ ئـــەم قەوارەشیرینـــەو ئـــەم کەرەستە بـــە نرخانەی بەخۆیگرتـــوە ، رووی دیـــواری کتێبخانـــەی سەرشەقامەکان وبن باخەڵی رۆشنبیرانی کـــوردی رازاندۆتەوە .. !

برا وبرادەرینە : تکایە و تکایەکی کوردانە ، گەر لەمەولا ویستتان بەوردی لەمەسەلەی چاپ وچاپکاری وچاپەمەنیو چاپاندن بدوێن ، تکایە وابە سەرزارەکی وهەروا بە ئاسانی بۆی مە ڕۆن ، چونکە تا رۆژنامەیێ یاگوڤارێکی کوردی سەرهەڵئـــەدات و ئەکـــەوێتە پێرەوکەو ئەشونما ئەکاتو دێتە کۆڕی تێکۆشانـــی ووشەی پیرۆزەوە ، هەزاران ژانو ژوور ئـــەکـــات وهەزاران ئەشکەنجە ئەبینێ وهەزاران بەندوباوی بۆ هەڵئە خرێت ..!!

**پیرۆزبێ یادی رۆژی سەرهەڵدانی رۆشنبیری نوێ .**
**شیرینتربێ وشەی پیرۆزی کوردی .**
**بەگوڕتربێ هەمو ئەو خامانـــەی کەلەیەکەم رۆژەوە بەشداریان لەو ماماڵیەکرد .**
**پیرۆزتربێ یادو ئەرکی هەمو ئەو دڵپاکە ناسراوو نە ناسراوانـــەی کـــە (رۆشنبیری) یـــان کـــردە (رۆشنبیری) ...**

# چەپکێ دڵسۆزیو ژیانێکی نوێ

ڕۆشنبیری‌نوێ ژیانێکی نوێ‌بوو لە هەمـــوو ـ ڕوویێکەوە .. دوای دە ســاڵ ژیـــان لە نـــاو شاروگوندەکانی کوردستان‌داو لەگەڵ چرۆو گۆپکەی تازە پێگەیشتوودا .. لە دنیای ئاودامـــان پاکـــی‌و بێ‌وەیی منداڵاندا .. لەو ئاواتو خەمە ناسکانەوە بۆ بەغدای پڕ لە بەیەکداهاتـــن‌و جەنجاڵـــی‌و ژیانــە خنجیلانەو سەمەرەکەی بەڕێوە بـــەرێتی گشـــتی ڕۆشبیری کوردی ..

هەر لەسەرەتایی چاو هەڵهێنانم لەوێ ، وایان تێ‌گەیاندم ، لەبەر هەندێ هۆی تایبەتی‌و جەنجالی ناو شوینەکە من لەوێ هەڵناکەم بەڵام پاش ماوەیێکی کەم بۆم ڕوون‌بۆون ئەو قسەیە تەنیا لە ڕوویێکەوە ڕاستەو دوایی دەگەڕێمەوە سەری .. چونکە لەو کارگێرە گشتیەدا هەستم دەکرد کە لە ناو کەس‌و دۆستەو دڵسۆزانی خۆمدا دەژیم .. چی لەوە خۆشترە سەر نووسەرو بەڕێوەبەری گۆڤارێ خۆی بە هـــاوڕێی دەستەی نووسەران دانێ .. چ لە کاتی کارکردن‌داو چ لە دەرەوەی کاردا ..

ئەوەی جێی بەختەوەریمەو بە دەستپێشخەری خۆمی دەزانم .. ئـــەوەبوو کە لـــە ژمـــارە ٣١ ی ڕۆشنبیری‌نوێ‌دا سەروتارێکم بە ناونیشانی « ساڵی ئافرەتانی جیهـــان‌و ژمارەیێکـــی تایبەتـــی .. » بلاوکردەوە کە پەیمانمان بە خوێنـــدەوارانـدا لـــە سەرەتای ساڵی ١٩٧٥دا ژمارەیێکی تایبەتی بـــو ئافرەتان دەربکەین .. هەوڵێکی زۆرماندا .. گەرچی هەردەم گرفت لـــە ئازادابوو .. بەڵام لـــە ڕۆژی ١١ـ١ـ١٩٧٥دا پەیمانەکەمان گەیاندە ئەنجامو بەدەیان ئافرەتی‌کورد .. هەر لە نەخوێندەوارانیانەوە تا بـــە قوتابیانی کۆلێژو ئافرەتانی مووچەخۆریش دەگـــات بەشداریان تیاکرد ..

لە ماوەی ساڵ‌و نیوێکی کارکردنم‌دا لەگەڵ هاوڕێ‌کانی تر‌دا .. توانیمان چەند تەقلیدێکی سوودبەخشی ڕۆژنامە نووسانە بە ئەنجام بگەیەنین .. وەك هەڵسەنگاندن‌و شیکردنەوەی بەرهەمەکانی ژمارەی پێشوو .. سەرەڕای ئەوەی سنوورێکمان بۆ وەرگێڕان دانا .. ڕۆشنبیری‌نوێ بە هەردوو زمانی کوردی‌و عەرەبی دەردەچوو .. لەو ئاستەدا رامان‌گرت کە وەرگێڕان لە هەموو زمانێکی بێگانەوە بێ بۆ کوردی‌و هەروەها وەرگێڕانی بەرهەمی ئەدەبی کوردی هەلبژاردە بۆ عەرەبی‌و بەم جۆرە گەلێ بەرهەمی پوخت وەرگێڕرا ..

ڕۆشنبیری‌نوێ دەنگ‌وڕەنگی لاوان‌بوو .. بەڕاستی دەوری خۆی لەم بوارەدا دی‌و دەستی‌دایە پەلی گەلێ خاوەن بەهرەو هانی بەرەو پێشەوە چوونی‌دا .. لەبەر ئەوەی گۆڤارەکەمان بڵاوکراوەیێکی ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری بوو کەمتر جێکەی باسی خواسی سیاسی تێدا دەبۆوەو ئەوەی لە بیرم ناچێتەوە لەم لایەنەوە .. ئەوەیە کە لە مانگی تەمووزی ١٩٧٥ دا سەرنووسەر داوای سەر وتارێکی لێ‌کردم بەبۆنەی جەژنەکانی تەموزەوە ..

لە هەموو حالەتێك‌دا ئێمە بەوپەڕی سەر بەستیوە کارمان تێدا دەکردو بەوپەڕی دڵسۆزیشەوە خۆمان لەگەڵ ڕۆشنبیردا دەرەنجاند بەبێ گوێ‌دانە دەوامی ڕەسمی‌و بەبێ گوێ‌دانە مادەو پاداشت .. بەدەیان شەو تا نزیکی نیوەشەو لە چاپخانەی ( الزمان ) بەدیار گۆڤارە خۆشەویستەکەمانەوە دەماینەوە .. تاوای لێ‌هات لە شێوەی هونەری‌و دەرهێنان‌دا هیچ چاپکراوێکی کوردی لەوەو بەری‌پێ نەگەیشتبێ .. بڵاوکراوەکەمان وای لێ‌هات پاشکۆی هەبێ‌و لەپاڵ ئەودا چەند نامیلکەو کتێبێکمان چاپکردو هەروەها ( ئەستێرە ) گەشەکەی ئاسمانی منداڵانی کوردیشمان هەر لەوێدا کەوتە جریوە ..

ئەمجا دەرکەوت کە دڵسۆزی‌و لە خۆبوردن کاری بایەخدارو گەورەی لێ دەوەشێتەوەو نوقم‌بوون لە زەلکاوی نیفاق‌و دووڕوویی‌دا تەنیا بۆ جێ‌ی‌خۆ خۆشکردن‌و خۆ قایم کردن نەبێ هیچی تری لێ سەوز نابێ .. جێ‌ی شانازیشمانە کە لەگەڵ کەم‌و کووڕیمان‌دا ئەو کارەی لەو ماوە کورتەدا گەیاندمانە ئەنجام جێ‌ی ڕەزامەندی نەتەوەکەمان‌بوو .

**● رؤوف حسن ●**

# بەبۆنەی بیرەوەری

## ـ رۆشنبیری نوێ ـ وە

● محمد امین هەورەمانی ●

زرەی تەلەفۆن !

هەلەو ! ... مەرحەبا ، سەرچاوم ، کێ بە جەنابتان ! لێم ببوورن کە ئەم پرسیارەتان لێ دەکەم ! چونکە بە ڕاستی وەك ئالوودەی دەنگەکەتان بووبم ، وایە ! ... ئەهلا ، مامۆستاگیان ، بە ڕاستی تاسەی دیدەنیتان دەکەین ! خۆتان دەزانن ، مامۆستا ، ئێمە ، بە بۆنەی کارو ئەرك و نوێی ئەوویێتانەوە ، هاتینە دیدەنیتان . بێگومان دەبێ ، ئێوە ، بۆتان ئەلوابێ ، ئەگینا بە ڕاستی قەرزارن !! ئێستەش بەڵێ ، فەرموون !! .... بەڵێ ! بەڵێ ! هەر لەژمارە سیفر(٠)یەوە .. بەڵێ ! ژمارە سیفریشی دەرچووە !

..... ؟ باشە ، بەسەرچاو ، ئەگەر پەلەم لێ نەکەی ! چونکە ئێوە شارەزان کە چەند ئیشمان زۆرە ! .... عەفوو چاوەکەم ! بەسەرچاو ، .... خواتان لەگەڵ . خەیاڵ ، بیرکردنەوە ، بەرەو دواوە .

نەختێ بە خەیاڵاچوون و پەرە هەڵدانەوەی دەفتەری بیرو هۆش ، لە قوژبنێکی **پەناوای** مێشکدا ، خۆی **هەشار** دابوو ، وەك شریتی سینەما ، بە قەوارە بچکۆلانە و بە ناوەڕۆك پڕ لە هەمە جۆر و چەش . بیرەوەری ی ئەو دەمەی کۆرپەیەتی ( ڕۆشنبیری نوێ )، بە ڕەنگ و ماوەو دەمەوە ، کورتە شریت چووە سەر شاشەی سینەمای مێشکم و بە قەدەر ماوەی چا خواردنێ ، چاوی بیر و هۆشم چووەوە بە ئیش و کارو کردەوەی تەمەنی چەند مانگێکی ڕۆشنبیری نوێدا ، بەو کارو کردەوانەدا کە شوێنەواریان زۆر ڕۆشن دیاری یە و ناچێتەوە .

چەند رۆژێ پێشی دەرچوونی ڕۆشنبیری نوێ
رازی بوونی وەزارەتی ڕاگەیاندن ، بەوەی ، کە بەڕێوەبەرێتی ی گشتی ی رۆشنبیری ی کوردی ، بلاوکراوەیەکی دەوری دەر بکا ، زوریەی کارگێرانی دام و دەزگاکەی دڵخۆش کردبوو .
ژمارە سیفری رۆشنبیری نوێ .

بلاو کراوەیەکی قەشەنگ ، لە نێو دووقەدی دوویەڕەی (جەریدە)ی ئاسایی‌دا ، واتە دوو بەڕە قەد کرابوون و هەشت لاپەڕەیان لێ دەرچووبوون . لە نێوچاوانی ئەم بلاو کراوەیەدا ، ژمارە سیفر ؛ کە رۆژی ١١ـ١١ـ١٩٧٣ دەرچوو ، لە نێو چوار

چێوەیەکی لاکێشی‌دا ، ئەم ڕستە کورتە ڕاگەیاندینە ، نووسرابوو : « ئەم ژمارەیە دیاری‌یە » .

بێ پەروا ، زۆر بە دڵسۆزیەوە ، حەزم لەوە دەکرد کە بە هەرجۆرێ بێ ، لە دەرچوونی ئەم بڵاوکراوەیە بەشدار بم بە تایبەتی دوای داوای دوکتۆر ئیحسان ، بەڵام بە داخەوە ، من هەر تەنیا نووسینی وتاری کورت کورت ـ دەربارەی هەندێ گۆشەی زمانناسی ـ م لە بارا بوو ، چونکە بە ڕاستی ئیشی دیکەی ڕۆژنامە گەریم نەدەزانی ! ئەگەرچی لە دوورەوە لە کارەکانی کەی ڕۆژنامە‌ـگەریم دەپرسی‌و بیرم لێ دەکردەوە .. ئەگەر دەربارەی وتاری من لە ژمارە سیفردا بپرسی ، دەتوانی لە لاپەڕە(٦)دا ، وتارێ بە ناونیشانی ـ لێکۆلینەوەی بەراوردی ـ ببینی !

جگە لەوەی کە پەیتا وتارم نووسیوەو کەم ژمارە هەبووە وتاری منی تێدا نەبێ ، ناو بە ناویش بە ناونیشانی ( N. R. ) ، بە مەرەکەبی سەوز ( کەسك ) بە ئیمزای دوکتۆر ئیحسان وتاری زمانناسی دەهات ، بۆ ئەوەی بیر و ڕای خۆمان ، دەربارەی ، دەربڕین .

لە سەرەتاوە، ژمارەی لاپەڕەکانی ئەم بڵاوکراوەیە هەشت لاپەڕە بوون ، تاوەکو ژمارە ( شەشی ) کە ژمارەی لاپەڕەکانی کران بە (١٢) لاپەڕە .

دەرکردنی ژمارە (٢٢) کە ڕۆژی ٢١ـ٦ـ١٩٧٤ دەرچوو ، وەك ئەرکێکی گران ـ وەك پەیکەرێکی **خۆفناك !** لە بەرچاو بوو، لە بەر هەندێ هۆ کە چارەسەریان نەبوو ـ کەوتە ئەستۆی من ..

بریاردان لەسەر ئەوەی کە هەر دەبێ دەرچێ ، بێگومان ، بە هاوکاری هەندێ کارکەری ئەو دام و دەزگایە ـ بەڕێوەبەریتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری ی کوردی ـ لەگەڵ شەونخوونی ئەو شەوی ( ٢٠ ـ ٢١ ) مانگی (٦) ی (٩٧٤) دا ، هەروەك سەرکەوتنێکی گەورە، دەسکەوتێکی بێ هاوتا ، پێش دەست‌پێ‌کردنی دەوام ، کاك ( جەعفەر ) بەرزنجێ کۆمەڵێ لە ژمارە (٢٢)ی لە هۆلەکەدا دانابوو .

بە نیسبەت منەوە ئەمە هەر لە بیر ناچێتەوە !! لە بەر خۆمەوە دەموت و دەموتەوە ! ( ئۆخەی ) ، ئەوە من بووم توانیم ئەم ژمارەیە دەرکەم ) . ( خوا ، ئەکا شتێکی زیانبەخشی تیادا بە دی نەکرێ ! ) .

پەیوەندی پەیداکردن .

بە هۆی بڵاوکراوەی ( ڕۆشنبیری نوێ )وە ، هەندێ پەیوەندیم پەیدا دەکرد ، کە لەوەوپێش ، ئەم دەتوانی جۆرە پەیوەند وەها هەبێ ! .

پەیوەندی لە گەڵ ، نووسەران ، لەگەڵ ئەوانەی کە پێویست بوون لە گەڵما کار بکەن و یاریدەم بدەن و هەندێ شت کە من پێیان نازانم پیشانم بدەن و فێرم بکەن ! پەیوەندی لە گەڵ خاوەن چاپخانە ، لە گەڵ ، کرێکارەکانی چاپخانەدا ، کە دەبێ ناو بە ناو ( شیر ) بخۆن بۆ ئەوەی قوڕقوشم کاریان تێ نەکا ! لە گەڵ نەخشەکێش و خۆشنووس و زۆری دیکەدا .

بێگومان دەرکردنی ئەو چەند ژمارەیە ، ـ لە ژمارە (٢٢) وە تا (٣٩) ـ دەرسی زۆری دادام ! زۆر شتی فێر کردم !! ڕواڵەتم لە دڵ و دەروون جیا کردەوە !!

لە گەڵ بوونی بڕ و بیانووی هەمە جۆردا ، لە گەڵ بەرپا کردنی کۆسپی نالەباردا ، بە یارمەتی دڵسۆزان و نووسەران و دام دەزگا ڕۆشنبیری‌یە کوردی‌یەکانی کەی کوردی ، و شەونخوونی و بیرکردنەوە و پیاچوونەوە بەوانەی پێشوودا توانرا ژمارەیەکی ڕازاوەی ڕێك و پێك دەر بکرێ !

وەك ، کردەوەیەکی کاریگەر ، هەندێ شەوی دەرچوونی ئەم ژمارانە ، وا ڕێك دەکەوت ، کە پێویستی بڵاوکراوەکە بە وتارێکی کورت هەیە ، بە دەست و برد دا دەنیشتم و شتێکم بۆ دەنووسی .

ئەوەی کە زۆر منی ناڕەحەت دەکرد ، هەڵەی زۆر بوو ، وەختی وەها هەبوو کە زیاتر لە وتارێ چاپ دەکرا بەبێ ڕاست کردنەوە !

بێگومان سەرگوزەشتەی وەهای شوێن دیاری زۆر دێنەوە بیر . بەڵام وایە بەس بێت .





# كه ئه‌ڵێن چۆن بوو



ئێمەشی ئەڵێین ...

● سفر له ریازییات دا نرخی نیه ئەگەر لای چەپەوە بێت بەڵام بەلای ئێمەو خوێنەرانی رۆشنبیری نوی‌ی خۆشەویست نرخێك و بایەخێكی مێژوویی تایبەتی خۆی هەیە ، ئەویش کە نیشانەی یەکەم ژمارەی رۆشنبیری نوێ‌یە کە بەناونیشانی دیاری‌یەوە دەرچوو ، ژمارە سفری رۆشنبیری نوێ ژمارەیەکی تایبەتی وەهەڵکەوتوو بوو له ٩٧٣/١١/١١ دا دەرچوو تا ژمارە (٥)ی کە لە ٧٤/١/١ دا دەرچووە بە ٨لاپەڕەو بە دوو هەزار دانە کەوتۆتە بازارەوە .

●ژمارە (٦)ی تا ژمارە ١٥ی لە ٧٤/٤/١١ دا دەرچوو بە ١٢ لاپەرە .

● لە کاتێکا لاپەڕەی ژمارەکانی پێشووی بەرەو زوور ئەچوو کەچی ئەبینین لاپەرەی ژمارە (١٦)ی دەرچوو تاکو ژمارە ٣٥ی کە لە ٩٧٤/١١/١ دا گەڕاوەتەوە ٨ لاپەرەکەی جارانی .

● ئنجا لەپڕیکا ژمارە ٣٦ی کە لە ٩٧٤/١٢/١ دا دەرچووە پەڕیوەتە ٣٢ لاپەرەو تەنانەت ژمارەی چاپکراوی گەیشتۆتە هەزار دانە .

● ئنجا ژمارە ٣٧ی کە لە ٩٧٥/١/١١ دا بووە تا ژمارە ٤٢ی لاپەڕەکانی هاتۆتە خوارێ بو بە ٢٤ لاپەرە .

● سەیر ئەمەیە کە چەن ژمارەیەکی رۆشنبیری نوێ‌یەکیان گرتوەو تێك‌ئاڵاون وەك بەریکی جمکە کە بەلەش یەکبن وبەڵام دووسەریان هەبێت ئاوا ژمارە ٤٣ و ٤٤ پێکەوە دەرچوون لە ٩٧٥/٨/٢١دا بەڵام لاپەڕەکانی ئەمجارە بە پیت بوون کە بە ٣٦ لاپەڕە بووە .

● لە نێوان ئەم گێژاوی دانەو لاپەرە وقەوارەیەدا ژمارە ٤٥ی کە لە ٧٥/١١/١ دا دەرچووە بە گەرایەوە سەر ٤٢ لاپەڕە کەیەوە ئەبێ هۆی ئەمە چیبێت ؟

● خوا ئەو خوایەیە کە ژمارە ٤٦ی لە شباطی ١٩٧٦دا دەرچووە بەڵام چ دەرچوونێك لاپەرەی بە پیت بووە بە ٤٠ لاپەرەو دانەش گەیشتوتە (٥) هەزار

● بەرەبەرە سەرکەوتنی بەخۆیەوە دی‌وە ژمارە ٤٧ی بە ٦٠ لاپەڕەو دەرچووە .

● دیسانەوە جووتە ژمارەی ٤٨ و ٤٩ی لە مایسی ١٩٧٦دا یەکیان گرتەوەو بە ٦٦ لاپەڕەو بە (٥) هەزار دانەی جاران دەرچووە .

ژمارە (٥٠)ی بە تەنیا مایەوە لە حوزەیرانی ١٩٧٦دا هاتەکایەوە .

● ٥١ و ٥٢ لە تەمووزو ئاب دا بە ٧٤ لاپەڕە دەرچوون .

● ئنجا ژمارە ٥٣ هاتەوە سەر ٥٨ لاپەرەو بەس ، وابزانم لە ئەیلول اگەڵای دار دەست ئەکا بە دەرین ئەوەری ئەیش چاوی لەوکرد هەندێ گەڵای وشك وزەردی خۆی وەران لەم مازگەیە .





# چۆن نه بوو



● ژماره ٤٥ی هەندیك خۆی پۆشـنه كردەوە كەبەرەو زستان ئەڕویشت وبه ٧٤ لاپەرە چاپكرا .

● كه ژماره ٥٥ و ٥٦ی جمكه له كانونی یەكەمی ١٩٧٦دا پێكەوە دەرچوون هۆی سەرمای زسـتان بوو كه خۆیان له تۆیی ٨٢ لاپەڕەی گەرم ونەرمـدا پێچابووه .

● بەڵام ژماره (٥٧)و ژماره (٥٨) و (٥٩)ی جمك كه له شوبات وئاداری ١٩٧٧دا دەركەوتن وەك گوێ بەهار خونچەی بەهەر چوار لادا پشكنوو لەهەمەجۆر گوڵی رەنگاورەنگی تیا گەشایەوەو تەنانەت لاپەڕەكانی وەك گەڵای دارێكی سەوز پەرەی‌سەندوبوو بـه ٩٨ لاپەڕه بەلكو دانەی چاپكراوبشی گەیشت بـه (٥) هەزارو سێ سەد .

● بیستوومانه دوو ژماره دوو ژماره بەیەكەوە دەرچن بەڵام ئەمجاره به پیچەوانه یەك ژماره به دوو مانگ دەرئەچوو ، ئەویش ژماره ٦٠ بوو له نێـوان نیسانو مایس‌دا به ٨٢ لاپەرەو هەروەها ژماره ٦١ی حوزیـران .

● بۆ ماوەیـەك سـستی كـەوتـه دەرچوونی روشنبیری نوی كەهەر ژمارەیەك دوو مانگی ئەخایاند وەكو ژماره ٦٢ كه كەوته تەمووز وئابی ١٩٧٧ وبـه ٧٤ لاپەره هـەروەها ژماره ٦٣ كـەوتـه ئـەیلول وتشرینی‌یەكەم .

● ئنجا له ژماره ٦٤ی تشرینی دووەم وكانونـی یەكەمی ساڵی ١٩٧٧ تا ژماره ٦٦ی ئاداری ١٩٧٨ به ٨٠ لاپەڕەو ئەكەوته بازارەوە .

● له نیسان ومایسی ١٩٧٨دا ژماره ٦٧ بـه ٨٢ لاپەرەو شەش هەزار دانه دەرچوو ژماره ٦٨ كەوتـه حوزەیران وتەمووزەوەو به ٨٢ لاپەرەو ٨ هەزار دانه

● بۆ یەكەم جار ژمارەیەكی تایبەتی لـه تەمووزی ١٩٧٨دا به ٦٤ لاپەڕەو به (١٠) هەزار دانه دەركرا .

● وەك بڵێین بۆچاولێكەری لـه ئابی ١٩٧٨دا ژماره ٦٩ هەر به ٦٤ لاپەڕه مایەوەو گەرایـەوە ٨ هەزار دانەی جاران .

● ژماره (٧٠)ی كه له ئەیلول ـ تشرینی‌یەكەمی ١٩٧٨دا دوا بەدوای ئـەو ژماره ٧١و ٧٢ی كـه هەریەكه دوو مانگی پیچووە ئنجا ژماره ٧٣ له ئاداری ١٩٧٩دا به ٨٢ لاپەڕه دەرچووە .

● بەڵام ژماره ٧٤ حوزەیرانی ١٩٧٩دا پەڕیوەتـه (١٠) هەزار دانه وبـه ٨٢ لاپەره دەرچووە هەروەها ژماره ٧٥ .

● بەڵام ژماره ٧٦ دەرچوو به ٨٢ لاپەرەو ژمارەی چاپكراوی گەیشته (١٤) هەزار دوا بەدوای ئەویش ژماره (٧٧) بوو .

**روشنبیری‌نوێ**

# پاڵەوان لە کۆمەڵە چیرۆکی - بوار - دا

## بەشی دووەم

محمد فریق حسن

پاڵەوانی چیرۆکی ( ١+١=١) کرێکار بووەو ئێستا بەتاڵەیە . لە بارێکی دەروونیی شڕدایە ، ڕاڕایە .. « نینۆکی خستەبەر بەزەیی دانەکانی‌و بە دەوری خۆیدا خولی خوارد . » (٧) تەنیا باڵە . کەسێ شک نابات تەنانەت دەمەتەقێیەکی لەگەڵدا بکات . بەپرسی ژنەکەی بێزار کردووە . کرێکاریش وەکوو ڕاستییەکی سەلمێنراو ، کە لە چینەکەی دابڕا ، ئیتر هێزو ووزەی نامێنێ .. (حەمە)ی هاوڕێی دێتەوە یاد کە هەر لەم خانووەدا گیانی سپارد . دوو ڕێگەی لەبەرە : « ڕێگاکە بوو بەدووان بەڵام لە خاڵێکدا یەک دەگرن . » (٨) دیارە ئەمەش بۆ چوونێکی ناڕەوایە ، بە تایبەتی بەلای کرێکارێکەوە کەزوو تر خۆی ساغ دەکاتەوە وەک لە کەسانی تر . نووسەر دەیەوێ کاکڵەی بیری خۆیمان بخاتە بەر دەست‌و بڵێ هەردوو ڕێگاکە دەبنەوە بەیەک باخود ( هەردوو ڕێگاکە بۆ بانە دەچێ ئەمەشیان دژ بەو ڕاستییەیە کە مێژوو سەلماندوویەتی . ئەویش بوونی دوو ڕێگایەو هەریەکەشیان بۆ شوێنێ دەچێ‌و هەرگیز لە خاڵێکدا یەک ناگرن .

لە چیرۆکی ( شەو ) دا ، چوار ڕۆشنبیرمان پێ دەناسێنێ لە کاتی لێقەوماندا .. « شەقامی ترسیش ماری بوو بەناو شاری دڵیانا خۆی کێش دەکرد . » (٩) ترسەکە ئەوەندە زاڵە هەر ئەوەیە گوێت لە دەنگی دڵو چاوت لە لەرزینی ئەژنۆیان نییە .. دیارە ئەمەش شارەزایی نووسەر دەردەخات لەوێنە کێشانی دیوی ناوەوەی مرۆڤ لەو جۆرە لێکەوتنانەدا .. چوار پاڵەوانەکە تارماییان لێ دەبێتە دڕندەو کەڵێی دەخوڕن ( بەرمیل ! ) دەردەچێ .

« لێیان خوڕی دەنگ نەبوو ، کە چوونە پێشەوە بەرمیلە ئاوە کۆنەکە بێ تەڕایی ملی بەلارەوە نابوو . »(١٠) .. سەرەتا وادەردەکەوێ کە بە ئاگاو هۆشمەندن : « ئەوەی ئێمە دەیزانین ئەوان سووسەیان بکردایە دەمێك بوو پاکۆ درابووین . » کەچی دوای ماوەیەک دابەلۆ گێکت بەرچاو دەکەوێ بێ ئاگایییان دەردەخات . « ـ دەبوا سەرەتا بمانزانیایە ئۆتۆمیلێکی فورمیسن . » (١١١) دیارە ئەمەیان ڕاستیی قسەکەیە . چونکە ئەگەر سەرەتا وایان بزانیایە ئێستا بارستایی ڕووداوەکە لە پەل‌وپۆی نەدەخستن .. **هەر چۆنێ بێ ئەو پاڵەوانانەش ( بەقەدەر قەوارەی خۆیان ) بەشدارن لە دروست بوونی ئەو تراژیدیایەدا .**

ئەم چوار پاڵەوانە لەو تەنگانەیەدا بە تەواوی هەڵوێستو زمینەی خۆیان دیار دەکەن . ئەو شتانەی کە هەتا چەند ساڵێ لەوەوبەر گەلێك لایان پیرۆز بووەو ڕێزێکی تایبەتییان لێناوە ، هەر بەو گەرماوگەرمییە لە بەرچاویان

دەبێزرێت . بەمەش ئەو چـوار پاڵەوانە بەشـێکی گرنگ لە کیانو مێژووی خۆیان ڕەت دەکەنەوە . بام سەرنج بدەین بزانین ئـەو چـوار پاڵەوانە چـۆن هەڵدەگەڕێنەوە : « وێنەیەکی گوگوش نە پاڵ مێزەر بە سەرەکـەوەیە ، مێش کوژێک ، فلچەیەکی قۆندەرە ، دەسـتەیەک کۆنکەنی نایلون . »(١١) .

پاڵەوانی چیرۆکی (دانپیانان) سیمایەی دیاری نیە . لە کردەوەو گفتو گۆو هەڵسوکەوتیدا کەسێکی کورد زمان نا خوێنینتەوە . زیاتر لە تارمایی دەچێ . ئەم مرۆڤە لـە ژیانیدا بەشی راونانە . بۆ هەرکوێ دەچێ مێردەزمەکە بـەدوایەوەیەو بوارەی نادات . تەنانـەت لـە خەویشدا وەکو شملی شـەڕ لێی پەیدا دەبێو فەستی سەری دەکات. لەوەدەچێ تاوانێکی کردبێو هەست بە ئازاری ناخی خۆی بکات ، بۆیە تووشی کۆمەڵێ گرێو گۆڵ بووەو برستی لێبڕاوە . هەردەم لە دڵـە ڕاوکێدایە . کە جگەرە دەکێشێ بە لێویدا دەچزێو بە خـۆی نازانێ . هەرچۆنێ ئەم پاڵەوانەش ناتوانـێ خۆی لەو بارە دەروونیە قوتار بکا کە تێی کەوتووە . ئەوەندە نەبێ ، بەوە تەسەلای خـۆی دەداو باری لەش سـووک دەکات کە بۆ خەڵکی دەگێڕێتەوە .

ئەوی راستی بێ هەندێك لـە چیرۆك نووسەکانمان خراپ لە نوێ کردنـەوە گەیشتوون .. هـەن نوێبوونەوە لە تەمو مژدا دەبینن . دەیکەن بە تەمو تومـانو گورگـە ڕۆژێک چاو چاو نەبینێ، سەرەنجام خوێنەر مێشـکی ماندوو دەبـێو هیچی تر .. بەڵام ئاخۆ مانـدوو کردنو مێشـك گوشینی خوێنەر لە فرمانەکانی ئەدەبە ؟! بـەلای منەوە بەکارهێنانی تەمو مژ لەهەر بوارێکی هونەردا بۆ چەند مەبـەستێک بەکار دێ .. یان ئەوەتا نووسەر خـۆی بیری ئاڵۆزو تەمو مژاوییە ، خاوەنی بنەمای فیکریی خۆی نیە ، لـە جەنجاڵیی بەیەکـدا چـوونی بیرەهەمەجۆرەکاندا سەردەرناکاتو هـەر ئەمسەردەرنەکـردنەشە لەهونەرەکەیدا ڕەنگ دەداتەوە .. یاخود چاك سەر جەنجاڵێو بە یەکا چوونەکە دەردەکاتو بە ئارەزووی خۆی تەمو مژ دروست دەکات بـۆ ئەوەی بیکات بە بۆمبای دووکـەڵ تاکو لەو دیویەوە پاشەکشە بکـاتو خۆی شارێتەوە .

بەڵام ئەم پرسیارە لـە جێی خۆیدایە:داخۆ دەکرێ نووسەر خۆی لە جەماوەر بشارێتەوە ؟!.. ئەی بۆ کێ دەنووسێ ؟!..

ئەمجا نۆرە دێتە سەر ( چـوار چیرۆکی کورت ) ، کە دەبوا ناویان وانەبوایە . چونکە بۆمان هـەیە . بپرسین:ئەی ئەوانی تر چیرۆکیکورت نەبوون ، چی بوون ؟! .. ڕەنگـە بینووسیایە : ( چوار چیرۆکی زۆر کورت ) باشتر بوایە ، تاکوو لەوانی تریان جیابکاتەوە .. مامۆستا شێخ محەمەدی خاڵ لە فەرهەنگی خاڵدا! بەرامبەر « اقصوصە » ی عەرەبی ، « چیر چیرۆك »ی بەکار هێناوە . ئەمیش دەیتوانی بەکاری بهێنێ .. لە یەکەمیاندا پاڵەوان گێژۆکەیە. بە شێوازی گێڕانەوە (سرد)ی رووت ، باسی کۆلارەکەی ئەمجارەیمان بـۆ دەگێڕێتەوە ، کە لەوەی سەردەمی منداڵیی گەورەترە . لـە ناکاودا دکەوێتە سەرهاویشتنو زریان لـە دەستی دەفڕێنێ . ئەمیش زۆر بۆی داخدارە .. نوقلانەی خراپیش بۆ کۆلارەی خەڵکی تر لـێ دەدات . پاڵەوانەکـە لەوە بێ ئاگایە کـە کۆلارەکـە بە دەزوو ، فەنـەرو ، کاغەزەوە هی خۆی نەبوو . کەچی وەکو پاڵەوانەکەی چیرۆکی سبوار-لێرەشدا بڕوای وایـە ڕێکـەوت دەستی هەبووە لە لە ناوچوونـی کۆلارەکەیدا .. دەبوایە بیزانیایە ، کۆلارەیەك بە بەدڵو گیان دروست بکرێ ، نە سـەردەهاوێژێو نـە خاوەنەکەشی بە هەوانتە دەیـدات بەدەم زریانەوە .. دوای ئەوەش بۆ دەبێ هەموو ئاواتێکی بەسترابـێ بەو کۆلارەیەوە ؟!.. دەبا مشووری کۆلارەیەکی چاکتر بخوات ..

لە لەیەکێکی تریاندا، کەدیـان بە شێوەی گێڕانەوەیە . پاڵەوانە کە یادگاری منـداڵێو شێتەکانـی سێلمانی دەگێڕێتەوە . دەیەوێ لەو بـەردەبازەوە بپەڕێتەوە بـۆ ڕۆخیجیهانێکی فراوانتر . یاخـود لە شتێکی بچکۆلـەی تایبەتیـدا مەسەلەیەکی گەورەتر بوروژێنێ .

بەڵام توانای بەسەریدا ناشکێو لەعەوەینایە . پاڵەوانەکە ئاوات بۆ ( سـالە شێت ) و بەردەفرکێکەی دەخوازێو حەزی لە چارەی ( خولە بووز )ی بێ وەی نیە !.. بەڵام نـە ( سـالە )و نە ( خولە ) هیچ کامیان جێی هیوا نین . چونکە مێشکیان نەخۆشە . کەمێشکیش نەخۆش بێ چوارپەل چیی پێ دەکرێ جگە لـە پەلکوتانی بێ هوودە نەبێ .. نـە بەردە فرکێی بەردەوامو نە ئەوەی ( خولە ) کە هەمیشە لـە تاوی ڕەشەبا دەستی بە کڵاوەکەیەوەیە

لەم چیرۆکە زۆر کورتانەدا ، خوێنەر هەست بە بوونی درامایەك ناکات ، کە بڕبڕەی پشتی چیرۆکە.. ئەگەر هەیە ، کوان هەردوو سەری

ئەو ناکۆکی‌یە ؟ .. سالەو خولـــە لەگەڵ کێدا لە زۆران بازیدان .؟.. لەسەر چی ؟.. کام لایان راستە ؟.. ئەمانەو گەلێ پرسیاری تر ، بـــە تایبەتی لەم چیرۆکە زۆر کورتانەدا دەم دەکەنەوە .. ئەوی راستی بـــێ ئەم چیرۆکە نۆر کورتانە زیاتر لـــە بارچە پەخشان دەکەن ..

پالەوانی « خالێتک لـــە پاش زمارەوە » (١٣) شار بەجێ دێڵێ : « ئەت ویست هـــارەی مەکینـــە زلەکانو ژاوەژاوی کارگەی شـــار بەجێبهێلیت . » ئەم پالەوانەش هەر لە سەرەتاوە خۆیمـــان پـــێ دەناسێنێ کەمرۆڤێکی شازە، چونکە خێرخواکان هەمیشە . ئاوات بەوە دەخوازن کە زمارەی کارگەکان پتـــر بێ ، تاکو کەمتر پێویـــستیمان بەکەلو پەلی بێگانە ببێو داهاتـــی وڵات نەچێتە باخەلیانەوە . لە لایەکـــی ترەوە تەکانێکە بۆ گواستنەوە بـــۆ قۆناغێکی پێشکەوتووترو ژیانێکـــی خۆش گوزەرانتر .. عەجەبا دەبێ چی وای لـــێ کردبێ دژی کارگەو شـــارســـــتانیەت بوەستێ ؟!.. چیرۆکەکە هیچ بـــەلگەیەکمـــان ناداتەدەست .. لەم چیرۆکەدا، دوو ژێرخان لە وڵاتێکدا هەست پـــێ دەکرێ ، ئەویش لە یەک کاتدا .. چۆن ؟ .. لە شـــاردا ژێرخـــان سەرمایەداری‌یە « ژاوەی گەراجێکی گەورە، دووکەلێکی خەست،گۆشتی قوتور ، هارەی مەکینە ، هـــەوای بۆگەن .. هتد » .. کەچی لەهەمان کاتدا لە لادێ ژێرخان فیودالی‌یە . بام چیرۆکەکە پێمان بلێ :

« ـ بۆ گەیشتیتە شارستان ؟

ـ زولم ، رۆلـــە زولمی ئاغـــا رەواندینـــی ، ئـــەزانی لـــەم دڵرەقو بێ ویژدان تر مـــەکینەو گوبەندی شارە .

ـ ئەی چۆن گەرایتەوە ئێرە ؟

ـ بوومە درکی ناوچاوی ئاغا ، گوڕی کەس‌و کارو کوڕەکەیشم لێرەن .

ـ ئەوێت باشتر نەبوو ؟

ـ شار ؟ ئاسنگەر خانەیەکـــە بـــۆ خۆی . » (١٤)

کۆمەلگای وەها نی‌یەو نابێ . لـــە لایەکـــەوە تەپ‌و هوڕی مەکینـــە سـەر کاس بکات لە شـاردا ، لـــە گوندیشـدا تەنانەت کەوچکیش دەست نەکەوێ .. « بۆ تێکدانی چایەکە قەلاسکە گەنمێکی سپی‌و سۆلـــێ دایێ . » یاخود دەلێ : « لەسـەر بادەکە دانیشتی . کەلانەی گەرم‌و جامێک دۆی ساردی بۆ دانایت ..» لەو گوندە بەولاخ گێرە دەکەن ؟!.. کۆمـــەلگای وەهـــا دوورە لـــە واقیعەوە . چونکە ئەگەر قۆناغەکە سەرمایەداری بێ‌و کارگە بەو جۆرە پری شارستان بێ،ئەو حەلە جیاوازی میانەی شارو گوندیش کەم دەبێ .. خۆ ناکرێ گوندەکـان لـــە شوێنی خۆیان بچەقن‌و بەو دواکەوتووی‌یە بمێننەوە .. وەکو تریش تەنهـــا کۆمبرادۆرەکان دژی پیشەسازی کردنی وڵاتان دەوەستنەوە . چونکە دوای فەراهەم هێنانی بەرهەمی خۆ وڵاتی ئیتر ئەوان زیانێکی گەورەیان لێ دەکەوێ بەوەی چی‌تر بازرگایان لەگەڵ وڵاتە سەرمایەدارەکاندا بـــۆ ناکرێ . بۆیە هەمیشە دژی کارگەو دووکەلێ کارەگـەی خۆولاتـــین . ئەمانە دژی هەموو گەشەکردنیکن . چونکە بەزیانی خۆیان دەشکێتەوە . هەروەها کۆمبرادۆرەکان بەشداری‌ی خەباتە نیشتمانی‌یەکانیش ناکـەن . چونکە قازانجیان لـــەوەدایە کـــە وڵاتەکەیان بە ڕەوڕەوەی ئابـووری بێگانەوە بەسترابێتەوە .. بـــەلام ئاخۆ توێژی کۆمبرادۆر لەم وڵاتەدا هەیە ؟!.. بێ‌گومان نەء .. ئـــەی کەواتە ئەم چیرۆکە باسی واقیعـــی کوێ دەکات؟..ئەم پالەوانە ئەوەندە دوژمنی بەرەو پێشـــەوە چوون‌و کارگەیە جۆرە حەساسیەتێکـــی لەگەلیاندا پەیدا کردووە. بام بزانین چۆن کۆتایی چیرۆکەکـــە دێ .. « کـــەلـــە دوورەوە ستوونـــی دووکەلەکەت بینی رووی شـــاری داپۆشیبوو ، هەستت کرد کلکـــی سەگێکیت دە سالّ لە قالبا بیـــت هێشتا لاریت . » رەنگە پالەوانی ئەم چیرۆکـــە وا لێ‌گەیشـــتبێت مەکینەو ئامێرەکانـــن کـــە مرۆڤ دەچەوسێننەوە و گوناحەکە لە ملی ئەوانە !!

ئەدەبوو نووسەر چیرۆکـــی یازدەهەم ناو بنێ ( بوار ) . چونکە بابەتەکە کـــوت‌ومت مێـــژۆلۆجیای سیزیفەو دەسکردی خەیالێ خـــۆی نی‌یە . دەبوا وەکـــو ئەمانەتێکـــی ئەدەی ناوی بنایـــە ســـیزیف ، ئەفسانەی سیزیف .. شتێک لەم بابەتە . هەروەک چـــۆن ( ئۆدیپ ) مێـــژۆلۆجیایەکی کۆنەو ســـەرەتا سۆفۆکلیس کردوویەتی بە شانۆ . ناوەکەی خۆیشی لێ ناوەتـــەوە . توفیق‌الحکیم‌و طەحسین‌و کێ‌وکێ‌ی تر هەر نووسیویانەو سوودیان لەو کەلـــەپوورە وەرگرتووە . بـــەلام هەمووشیان هەرناویـــان نـــاوە « ئۆدیپ » . لەم حالەشدا بە ناوی خاوەنەکەیەوە ناودەبرێ . دەووترێ ئۆدیپی ســـۆفۆکلیس . ئۆدیپـــی توفیق الحکیم ... هتد . وەکـــو ( مەم‌و زین ) ەکانی لای خۆمان .. هی ئەحمەدی خانی ، هی مەلامەتا .. هتـــد . دیارە مـــەم‌و زیـــن مێـــژۆلۆجیا نـــی‌یـــە . چونکـــە

پاڵەوانەکانی مرۆڤن . هەر وەکو نموونەی کەڵك وەرگرتن لە کەلەپوور هێنامەوە . با ئەمەیان لێرەدا بوەستێ .. لە لایەکی ترەوە ئاخۆ نووسەر چ مامەڵەیەکی لەگەڵ سیزیفدا کردێ ؟ کوتومت وەکوو خۆی هێناویەتەوە .. لەودا تاشەبەردێکی بەسەر شانەوەیەو دەبێ سەری بخاتە سەر چیاکە .. قورسی تاشە بەردەکەو بەرزی چیاکە مەسەلەکە وەکوو کۆیانەکەی حەجاڵ لێدەکات .. هەموو جارێك بەردەکەی لەشان بەردەبێتەوە دیسانەوە بۆی دەخزێتەوە خوارەوەو هەڵی دەگرێتەوە . لە بواریشدا هەمان دەستوور . کابرای پاڵەوان خۆی بە سیزیفە ئەسڵییەکە دەزانێ‌و تاشەبەردەکەی بەسەر شانەوەیە . ئەوەندە هەیە ئەم دەیەوێ لە روبارەکەی بیپەڕێنێتەوەو بکاتە روخی ئەو بەرو بۆی ناکرێ . بەڵام لەهەوڵدان کۆل نابێ .. لای ئەم چیاکە بووە بە روبار . بەوەش دەردی کاری بووە . چونکە رادەی قووڵی‌و خوڕی ئاوەکەی وەك بەرزی‌و لووسی چیاکە لا هەبان نییە . دوای ئەوەش نەیتوانیوە مامەڵەیەکی نوێی لەگەڵدا بکات‌و هەر گواستنەوە فۆتۆگرافییە میکانیکییە رووتەکەیە .. مامەڵە کردن لەگەڵ کەلەپووردا هەروا ئاسان نییە .. تێگەیشتنێکی تەواوی کەلەپوورو ئێستاشی دەوێ . ئەگینا هیچ پێویستی نەدەکرد پەنا بەرێتە بەر کەلەپووری وڵاتان . لای خۆمان گەلێك بابەتی وەهامان هەیە کە نووسەری لێهاتوو دەتوانێ بیکاتە پردێك بۆ پەڕاندنەوەی روانینەکانی . هەر چۆنێ بێ لەو مامەڵە کردنەی نووسەردا هەست بەوە ناکەین لەچاوە خۆیەوە بۆ سیزیف دەڕوانێ‌و سەر لەنوێ بەزادەی بیرو بۆچوونی دایڕشتۆتەوە .

## پوختەی تێبینییەکان

● بە نیسبەت ژمارە ئەو چیرۆکانەی کە نووسەر نووسیونی، زۆر لە پاڵەوانەکان شازو بە گرێ‌و گۆڵن . پاڵەوانەکانی « لە فەرهەنگی ئارەزووی ئەم شارەدا» ئاڵۆشاوین‌و پەردەیان لە نێواندا نەماوە . کچەکەیان رقی لە هەموو مرۆڤ دەبێتەوە . پاڵەوانی « سفر لە پاش ژمارەوە» قینی دنیای لە شارستان‌و کارگەیە . پاڵەوانی « دان پیانان »وا هەست دەکا مێردەزمەیەك هەمیشە بە دوایەوەیەو دەیەوێ ئازاری بدا . تووشی « پارانۆیا » بووە . لە چیرۆکی « شێت » دا سالە شێت‌و خولە بووز سوارچاکی مەیدانن .. بە شێوەیەکی گشتی کۆمەڵە چیرۆکەکە لە عیادەی پزیشکی نەفسی دەکات . لەو بڕوایەم ئەو جۆرە گرێ‌و گۆڵ‌و نەخۆشییە نەفسییانە بەو رادەیە زیاتر لە کۆمەڵگای رۆژئاوادا بڵاو دەبێتەوە . کوردێکی دڵ پاك‌و سینەساف لەو نەخۆشیانەوە دوورە .

● هەست بەوە ناکرێ ئەم رووداوو پاڵەوانانە سەر بەم وڵاتەبن . تەپ‌و هوڕی کارگە بەو رادەیە . تێك بەربوونی بەورادەیە. چیرۆکەکان لە واقیعی ئێرە دووردەخەنەوە .

● هەندێ جار پاڵەوانەکان دەیانەوێ لە مەسەلەیەکی گرنگ بدوێن . بەڵام لەبەر نەبوونی زەمینەیەکی بتەوو کەڵچەرێکی فراوان ، بۆ پاڵەوانەکان ئەلواوە لە خۆیانەوە بچن بۆ کۆمەڵ . یاخود شیاوتر وایە بڵێم : لە تایبەتییەوە بۆ گشتی‌و بەستنەوەی زات بە مەوزووعەوە . یاخود تێکەڵ کردنی زات‌و مەوزوع ، بەتایبەتی لە چیرچیرۆکی (راو) و (شێت)دا ..

● زوربەی پاڵەوانەکان گێژۆکەن . هۆی ئەو گێژاوە نازانن کە لێی کەوتوون . نووسەر تەنها ئەنجامەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە ئەمەش هیچ گرنگ نییە . چونکە هەموو کەس پێی دەزانێ . گرنگ پێشبینی کردنە لەسەر بناغەیەکی زانستی . هەروەها گرنگ ئەو هۆیانەیە کە کۆبوونەوەو کۆلارەکەیان دایە دەم رەشەبا . بوونە هۆی سەرنەگرتنی ئەو خۆشەویستییەو سەریشی لە پاڵەوانەکانی چیرۆکی « شەو » تێکدا . ئەو پاڵەوانانە ئامادەن بە هەمان هەڵەدا بچنەوە ، چونکە زانست لای ئەوان بایەخی نییە . رێکەوت‌و سۆز رۆڵی سەرەکی دەبینێ . چیرۆکی سەر بە رێبازە پێشکەوتووەکانی ریالزم زیاتر لەهۆ دەکۆڵنەوە تا ئەنجام .

● نووسەر بواری پاڵەوانەکانی نەداوە بە بەمێشکی خۆیان بیر بکەنەوە. سەربەستی هەڵسوڕاندن‌و بیرکردنەوەی لێ قەدەغە کردوون‌و خۆی رۆڵی زۆریان دەبینێ‌و بووە بە چاوساغیان . ئەگینا کرێکاری « ١+١= ١ » وەها سەرنجی دەوروبەری خۆی نەدەدا . پاڵەوانی ( بوار ) وازی لە رێکەوت دەهێنا . پاڵەوانەکانی ( گەڕیدە )ش لەو هێزە غەیبییە خۆیان قوتار دەکرد .

● زۆر لە پاڵەوانەکان بێ پشت‌و پەنان ، تەنیا باڵن . ناتوانن بەسەر کۆسپێکی سەر رێیاندا

زاڵبـــن جورنەتی بڕیاردان شـــك نابەن .
کرێکـــاری « ١+١= ١ » لـــە دووریانێکدا بە تەنیا باڵی واقـــی وڕماوە. پاڵەوانی ( کۆلارە ) بە تەنیا بۆکۆلارەکەی دەگری. دووگەڕیدەکە ناوێرن بەرەنگاری ئەھـەیمەنەکان ببنەوەو هـــەڵدێن . پاڵەوانـــی « هێشتا هەز چاوەڕوانە » تاکـــو ئیستاش چاوەڕوانە .
● خۆ ئەگەر پاڵەوانەکان بتوانن لەو پانتاییە تەنگەبـەرەی تێـــدا دەگەڕێن دەرباز بـــن‌و بە راستی باوەش بۆ تەنگ‌و چەڵەمەکانی لای خۆمان بکەنەوە ئەوا لە زەوی خۆیان دابڕ نابن‌و بەرهەمەکانی نووسەریش دەبنە رەنگدانەوەی ئەم سەردەمە .
بە هیوام ئەم تێبینییانە سوودێکیان گەیاندبـــێ . بەتایبەتی لەکاتێکـــی وەهادا کە زۆربەی چیرۆکی کوردی بەرەو سێکس‌و عەبەس مل دەنێن . هەروەها بە هیوام برای نووسەریش لە ئاستی رەخنەدا سینگی فراوان بێ . بەوهیوایـەی جارێکی تـر بگەڕێینەوە سەر لایەنە گەشەکانـــی ئەم کۆمەڵە چیرۆکە . .

### پەراوێزەکان

(١) بوار ل/٥ .
(٢)(٣) بوار ل/٦ .
(٤) بوار ل/١١ .
(٥) بوار ل/١٢ .
(٦) بوار ل/١٣ .
(٧) بوار ل/٢٣ .
(٨) بوار ل/٢٤ .
(٩) بوار ل/٢٧ .
(١٠)(١١) بوار ل/٣٠ .
(١٢) بوار ل/٣١ .
(١٣) بەیان ، ژمارە (٤٦) .
(١٤) هەمان سەرچاوە .

## چالاك‌و راپەرایتی شانۆگەری کوردی

شۆڕە سواری مەیدانی شـــانۆو شانۆگـــەری وهونەرمەندی بلیمەت ماموستا (رفیق چالاك) کە لە ١ـ٣ـ١٩٢٥ دا وەك چرۆیەکـــی باخچەی هونـــەر پشکووت ، هەر لە منالیەوە خولیای هونەر کەوتـــە مێشکیەوە ، وەك ئارەزوومەندێك هاتووەتە کـــۆڕی هونەرەوەو بە پێی توانای خـــۆی لـــە بزوتنەوەی هونەری شانۆو مەیدانی گۆڕانی ووتن‌دا هاوبەشی کردووە . . .
هەر وەك خۆی دەڵێ‌و ئەوەی وام لێ دەکات لە مردن بترسم ئەوەیە کە مەرگ ماوەی ئەدەم ئەدات کە ئەوەی ئەمەوێ پێشکەشی بە رۆڵەی کوردی بکەم ببێت بەداخێك‌و لەگەڵ خۆم‌دا ببەمە ناو خاك ، لەبەر ئەوە تکام لە هەموو هونەر مەندێکی دڵسۆز ئەوەیە کە ئەوەی پێیەتی هەڵی نەگرێ بۆ سبەینێ ، چونکە مەرگ ستەم کارەو ماوەی مرۆڤ نادات بو هێنانەدی ئاواتی . » .
لە سالی ١٩٣٥ دا بۆ یەکەم جار هاتە سەر شانۆو دەوری خزمەت کارێکی بینی ، لەو سەردەمەداو پێش ئەوەش نواندن لە ناو گەڕەکەکان دا باو ووە ، هیچ گەڕەکێك نەبووە کە لە لایەن لاوەکانـــی ئـــەو گەڕەکەوە نواندنی تیا نەکرێت .
لە سالی ١٩٤١ دا لە (دار المعلمين الريفيه)دەرچوو، بووە بە ماموستایەکی بچکۆلانە لە قوتابخانەیەکـــی گەڕەکی مەلکەندی‌و پاش ئەوە خالیدی‌و کانیشکان .
ئەو چیروکانەی لە سەر شانۆ پێشکەش کردوون بەلای جەماوەری میللەتەکەیەوە خۆشی بوون‌و جێی رەزامەندیان بووە ، هەرچیەکی پێشکەش کردبـــێ دەستە بەرەیەکی بچووك‌و دیاریە کە لە کارایەکەوە کە بە کوردی هاتەدنیاوەو بە کوردی تیا ژیاوەو ، چی پێ کرابێ‌و رێگەی پـــێ درابێ درێغی نـــەکردووەو فریشتەی لای خواش نەبووە . ئەوەنـــدە بەســـە مرۆڤێك بتوانێ لە ناو کۆمەڵگایەکی وەکوو کۆمەڵگای ئێمەدا بتوانێ کارێکی وا بکات بۆ خەڵك شوێن پێی دیاربێت‌و بە سەر بەرزیەوە دەماو دەم بگێڕیتەوە کە ئیستا هەموو مرۆڤێك تامەزرۆی ئەو کارە هونەریانەیە کە ئەم هونەرمەنـــدە لای کۆمەڵێکـــی زۆر لـــە هونەرمەندان‌و بینەران کردوویەتی بە یادگارێکـــی شیرین .



# لەیادی شەش ساڵەی کۆچی دوایی (رفیق چالاك)ی هونەرمەندو چالاك و رابەرایەتی شانۆگەری کوردی

**محمد صالح عبدالکریم**

چیرۆکێکی شانۆی بە ناوی (لەرێی نیشتمان) دا نووسیوەو خۆش بۆ شانۆ دەری هیناوە بو باربوی لێ قەومادانی بوومەلەرزەی یەکەمی پێنجوین لە ساڵی ١٩٤٦ دا لە ئەیلول ١٩٤٦ دا هەر ئەو دەستەیە بۆ ماوەی هەفتەیەك لە هەولێر ، شانۆگەریەکیان پێشکەش کرد ، ئەمەش هەر بۆ باربوی لێ قەوماوانی بوومەلەرزەکەی پێنجوین بوو . ئەمانە یەکەم کۆمەڵی هونەری کوردی بوون کە بۆ جاری یەکەم شارەو شاریان کردبێ‌و بەرهەمەکانیان پیشکەش کردبێ ، ئەم هونەرمەندانەش ئەمانە بوون ( رفیق چالاك ، عبداللە سالار ، احمد وشیار ، محمد احمد طە ( کامەران ) شیخ رەزای گولانی‌و گەلێك هونەرمەندی تر .

لە ساڵی ١٩٥٠ دا لە ئێستگەی کوردی دامەزراو هەموو هەفتەیەك چیروکێکی تەمسیلی نیو سەعاتی پێشکەش ئەکرد ، وەرگێڕاو یان دانراوی خۆی بوو .

یەکەم تیپی تەمسیلی لە ئیستگە کوردی دامەزراند کە پێك هاتبوون لە : ( رفیق چالاك ، احمد دلاوەر ، احمد دەنگ گەورە نوری مەنبەر ، علی ابراهیم ، فایق چالاك ناو بە ناویش علی مەردان قادر دیلان ) .

لە رێگەی ئەم ئیستگەیەوە نزیکی شەش ساڵ تەمسیلی هەفتانەی پێشکەش دەکرد کە زیاتر لە دوو سەد تەمسیلی نیو سەعاتی کە زۆربەی تۆمار کراون ،

بۆ یەکەم جار لە مێژووی نەتەوەی کورددا ئۆپەرێتی دڵداری کورە شوان ) ی کاك محمد احمد طە ( کامەران ) لە لایەن ( رفیق چالاك ) ەوە ئاوازی بۆ دانراو بۆ ماوەی سی‌و پێنج دەقیقە لە ئیستگەوە بلاوکرایەوە . لە ساڵی ١٩٥٦ – ١٩٦٢ دا کۆمەڵی هونەر جوانەکانی دامەزراندو خۆی بە سەرۆك ئەندامانی ئیداری هەڵبژێردرا کۆمەڵەش بریتی بوون لە ( رفیق چالاك ، نوری وەشتی ، جمال بختیار ، قادر دیلان ، نجاتێ عبدە ولیم یوحنا ، رؤوف یحیی ) .

ئەو شانۆ گەریانەی هونەرمەند لە ژیانی دا پێشکەش کردوون لە کۆتایی ساڵانی پەنجادا شانۆگەری ( گڵۆی تازەی لەیل ) ی پشکەش کرد ، بابەتێکی کۆمەڵایەتی بوو ، شانۆگەری ( پیسکەی تەرپیر چیرۆکێکی کۆمیدی بوو ، دەوری قارەمانی تیا بینی ، هەر وەها خۆی دەری‌هێنا بوو . ( ووکی ژێر دەواری رەش ) نوسین‌و دەرهێنانی خۆی بوو ، چیرۆکێکی کۆمەڵایەتی بوو .

( خەسرو بوو یا ئەژدیها چیرۆکێکی کۆمیدی بوو .

دوا شانۆگەری ( دکتۆری دێم ) بوو لە هۆڵی خولدا لە بەغدا پیشکەش کرا کە ئەمیش هەر خۆی دەری‌هێناوو .

لە بەغدا کاروباری شانۆدا ، ئاوازی بۆ ئۆپەرێتی ( گوڵی خویناوی ) دانا هەر وەها لە ساڵی ١٩٥٢ دا بەرهەمیکی چاپ کرد کە بریتی‌بوو لە نووسینێك‌لەسەر مێژووی شانوی بە ناوی ( کارکردنی بەکەڵك ) بێ گومان هونەرمەند ماموستا رەفیق بە هوی ئەو دەنگە ناسك وپڕلەسوزەوە وەك گورانی بێژێکی ناوداریش پیستراوە کە توانیویەتی کار بکاتە سەر زۆر لە گۆی گرانی گۆرانی‌وو مۆسیقا ..

لە کوتایی دا ئەتوانم ئەوەندە بڵێم کە جیهانێکی تایبەتی بوو لە جیهانی هونەردا ، گوڵێك بوو لە باخچەی هونەردا خەزان لە ٣–١١–١٩٧٣ دا پەرەی گوێێکی باخچەی هونەری شانۆی کوردی هەڵوەراندو ئاوایی لە کۆڕی هونەرمەندان کرد .

# تیشکێک بۆ سەر دیوانی مەحوی

● سۆران مەحوی ●

هەموو هێلێکی ڕاستو چەپ هێنان .. یان گشت پیا هەڵدانێکی نابەجێیانە .. بۆ ڕەتکردنەوەو بەرزکردنەوەی بەرهەمێك .. ئەگەر لە لایەن ڕەخنەگرەوە ، بەرێو جێنەبی .. و بەڵگەی پێویستو زانستییانە ، باسەکەی نەسەلماندا .. بێگومان سەرجەمی ئەو ڕەخنەیە .. لای خوێنەران ، کە سەنگی مەحەکن .. لە ئاکامدا ، هەقی خوی،نادرێت..و لە پلەی بێ بەهای ، و کەم نرخیدا دادەنرێت .

دیارە ڕەخنەگر زۆر جاریش بووە .. بەهەر دوو بارە کەدا ، بە نووسینەکەی قایل بووە .. و کەچی خوێنەران کارەکەیان ( نسبی ) وەرگرتووە .. و ریسیان لێ گردۆتەوە بە خوریێ .. و بە پێی باری سەرنجو ئارەزوو بۆ چوونیان بۆ مەبەستەکە چوون .

ئینجا لە ڕوانگەی ئەو

مەبەستەوە .. ئەگەر چاوێك بە نووسینەکەی « عومەر مەعروف بەرزنجی » دا بگێڕین.. کە ماوەیەك لەمەوبەر .. بە ناوی « تیشکێك بۆ سەر دیوانی مەحوی »(١) .. لە گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێی ژمارە (٦٨)ی ئازاردا بڵاوی کردەوە .. لەو ڕووەوە زوو بە ڕاستی دەگەین .. و هەڵانەی بە تەوێڵی نووسینکەوەیە خێرا دەردەکەون .

جا لەبەر ئەوە ، منیش بە پێویستی دەزانم.. لەچەند لایەنێکی کەوە ، تیشکی سەرنجم .. بە ناوی « تیشکێکی کە بۆ سەر دیوانی مەحوی » و بەتایبەتی نووسینەکەی نووسەر ئاراستە بکەم .. ئومێدم زۆرە توانیبێتم .. لە باسەکەمدا .. چەند لایەنێکی شاراوە تر .. بۆ خوێنەرانی ئازیز ڕووناك بکەمەوە..

جارێ سەرەتا ، نابێ ئەوە فەرامۆش بکرێ .. گەڕان بە دوای بوژاندنەوەی سامانی کەلەپووری نەتەوایەتی .. و پشکنین بۆ بژار کردنو ساخکردنەوەی ئەو کارە گرانو بەهادارانە .. و بەتایبەتی لێکۆلینەوەی ( دیوانی مەحوی )(٢) .. کە لە مێژەوە ئەدیبان بە دەستی‌یەوە ماندووبوون .. دیارە کارێکی پیرۆزو ڕەنگینە.. سەرەرای ئەوەش لەو ساتەوە ، تا ئێستا لە لایەن شارەزایانی ئەدەب ، و ئەدەب دۆستانەوە .. جێگای چەندان ڕاوو بۆ چونو مشتو مڕبووە .

ئینجا هەندێ لەو ئەدیبە نازدارانە .. بەلای خوێنەرانەوە ، ڕاکان یان پێکاوێتی .. و بەشێکی کەشیان ، بە نیوەو نیوە چڵی ، بە ئەنجام گەیشتوون .. و لایەکی کەشیان ، هەر لە خامۆشیدا ماونەتەوە !! .

یەکێك لەو لایەنە شاراوانەی .. هێشتا کە جێگای لێلواندنە .. مەسەلەی « هونەریو فیکریو هەڵویستی ڕۆژانەی شاعیرە »(٣) کە ئەوە بوو ، کاتی خۆی مامۆستا « محەمەدی مەلاکەریم » لە « پێشەکی دیوانەکە » دا (٤) لێی دوا ..

.. و ئێستاش هەر هەمان مەبەست ، لە لایەن نووسەرەوە .. بە مەبەستێکیکەو ئامانجێکی تر ، دووبارە بۆتەوە ..

یەکێك لە مەبەستی وورووژاندنی ئەو باسە .. بێ شك پووچەڵ کردنەوەی ڕایەکی مامۆستا کاکەی فەللاحە .. بە چەند وشەیەکی وەك :ــ

« ساردو سڕ ، بە کزۆلی ، دەست بەتاڵ ، هەڵتەتروشکێت ، ڕای گۆترە ، هێلنیج....هەتەد ».

کە بڕوا ناکەم ئەو ووشانە ، هیچ فەرهەنگێکی ئەدەبی بەو نازدارو شەفافی‌یە گرتبێتی‌یە خۆی .

ئینجا نووسەر ، گرێ کوێرەی باسەکە دەکاتەوەو دەڵی :ــ ( کاك محەمەد توانیوێتی کە بە ووردیو لێکدانەوەیەکی زانستی‌یانەوە بەرەو ڕوویان بچێ .. و هەندێ تەپو تۆزی ڕۆژگاریان لێ بتەکێنێ و دیوی ڕاستەقینەی شاعیر ؛ ئەوەی ئەمڕۆمان دەربخات .. بە تایبەتی ئەو بەراوورده زیرانەی کە لە نێوان « نالی ١٨٠٠ ــ ١٨٥٦ » و « مەحوی ١٨٣٠ ــ ١٩٠٦ » کردوێتی .. بەنجە درێژکردن بۆ ئاستی بیری نەتەوایەتیو باوەڕبوونو بەچەند بڕو بووچێکی ژیان لە شیعرەکانی مەحویداو سەرکەوتنی نالی لەم بوارەدا ........ تا ڕاستیش وایە ڕایەکەی ، کاکەی فەللاح ، ڕایەکی هێندە ساردو سڕوبێ بناخە دەخاتە ڕوو ، هەروا بە کزۆلیو دەست بەتالی بە دیار بۆچوونەکانی‌یەوە هەڵتەتروشکێت .. و بێ بەڵگەو نموونە بەجێ‌یان دەهێڵێ ... )(٥)

جارێ بۆ ڕایەکەی مامۆستا کاکەی فەللاح ، بە پێویستی دەزانم .. بچینەوە سەر ، سەرچاوەی تێکستی وتە ئەسڵی‌یەکە .. و دەقاو دەقی وتەکانی بخەینەوەیاد .

پاشان لە دوو تۆی ئانی گەرمو گوڕی .. بەراووردکردنێکی زانستی‌یانەوە .. سوودی لێوەربگرین .. ئەوەتا کاکە ڕازی دڵی وا دەکاتەوە :ــ ( ئاشکرایە کە مەحوی یەکێکە لە شاعیرە بەرزو نەمرەکانی کورد لە سەدەی (نوزدەهەما (ئەگەر) شوێنی شایانو بێ شیاوی خۆی لە ریزی پێشەوەی « نالیو سالمو کوردی » و شاعیرانی هاوچەرخیەوە نەبێ .. ئەوا ( بێگومان ) لە شان بە شانی ئەو شاعیرە بلیمەتو هەڵکەوتوانەی کوردەوە دەڕوات )(٦) شیتاڵ کردنو شی‌کردنەوەی ئەو ووتەیە .. دەمان‌گەیەنێتە ڕاستی‌یەك کە مامۆستا کاکەی فەللاح .. ڕایەکی بێ‌پێچو بەنای دەربڕیوە .. « ئەگەرمان چاند سەوز نەبوو ! ».. واتە هەرگیز دانی بەوەدا نەناوە کە مەحوی شاعیر لەریزی پێشەوەی نالیدایە .. یان شاعیری بەجێ هێشتۆتەوە .

بەڵام گومانی لەوەشدا نەهێشتووە .. کە مەحوی هاوشانی ئەو شاعیرانە بووە .

یەکێکی کە گلەیەی نووسەر ، لە مامۆستا کاکە ئەوەیە :ــ

گوایە ( بێ بەڵگەو نموونە باسەکەی بەجێ‌هێشتووە ) (٧)

کەچی خۆشی لەو لایەنەوە . دەستەوسان بۆتەوە .. من پێم وایە ( کاکەی فەللاح ) و هەموو ئەوانەی مەحوی بە هاوشانی ئەو شاعیرانــە دادەنین .. سەرەرای رای تایبەتی خۆیان .. زۆرتر پەناو پشتیان بەو ( ئەدیبو شاعیرانی ) (٨) ، نیزیك دەوروبەری شاعیرەوە بەستبێت .. و قسەیان لەگەڵ قسەی ئـەواندا جووت کردبێتەوە ..

ئێستاش بۆ راستی قسە .. بە پێویستی دەزانم ، هەندێ لــە تێکستی شیعری شاعیران بخەمەوە ڕوو .. و سەرەتا لە شیعرەکەی ( فەوزی ) (٩) بەوە تێ‌هەڵچین ..

کە نووســەر لــە بــەڵگە هێنانەوەی قسەیەکیا ، بە نموونــە هێناویەتەوە

**گەرچی نالی‌و کوردی‌و سالم لـــە دەوری ماضی‌یا (١٠)**
**صاحێبی دیوانی عالی بوون ، لــە شیعری کوردی‌یا**
**گۆی سەبقەت هەر لەناوا مابــوو مەحوی پێی‌گەیشت**
**خستیوە مەیدان ، بەجێی هێشتی لە عەصری ثانی‌یا**

واتە :ـ هەر چەندە ئەو کەلە شاعیرانە .. خاوەنی دیوانی بەرزو رازاوەی شیعری کوردی بوون .. کەچی کاتی مەحوی هاتە ناوانەوە.. گۆی سەبقەتی خستەوە گڕ .. و بە زمان پاراویش ، لە دوای وعەسری ثانی‌دا .. ئەوانــــەی هەمـــوو بەجێ‌هێشتەوە ..

ئەمە وابی لێ کردم .. زیاتر بە باســـەکەدا شــــۆڕبیمەوە .. ئاوڕێکیش لە شیعرە جوانەکـــەی حەمــــــدی صاحێبقـــــــران ( ١٨٧٦ ـ ١٩٣٦ ) بدەینەوە .. و بزانین شاعیر دەرهەمە مەحوی لەو بارەیەوە چۆنی بۆچووە :ـ

**خەرمانی لەفظی کوردی ( کوردی ) کەکردی پێوان (١١)**
**( نالی ) کە نالی ، کاسەیەکـــی دا بەویش لێوان ..**
**تاراجی کرد ( مەحوی ئەفەندی ) بە لوطفی خۆی .**
**عوشریشی‌دا بە ( حەمدی ) ووتــی بیبەرە دیوان.**

واتە بیناخەی لەفظی شیرینی کوردی .. مستەفا بەگ دایناو .. نالی‌ی مەزنیش بەشێکی لـــەوەوە وەرگرت .. بەڵام مەحوی بە لوطفی خۆی توانی هەموو ئەو شــــتانە ، تالآن بکات و تەنانەت ئەوەشی لــە دیوانی حەمدی‌دا دەبینن ( عوشری ) زمان رەوانی مەحوی‌یە .

ئینجا ئەمانــە نموونـــەی ( شتی‌یەکە لە خەرباریــك ) .. و ئەگەر بەسەرنجەوە بڕوانینە دیوانی شاعیرانی کۆن‌و نوێ (١٢) .. نەك ئەو نموونانە ، بگرە چەندان نموونەی ڕەسەن‌و زندوو لەو بابەتانە .. کە راو بۆچونـــی خاوەنەکانیـــان دەردەخات .. بە ئاسانی گوڵچینی باغچەی رازاوە مەسەلەکە دەبن .. دیارە لەگــەڵ ئــــەوانـــەش‌دا .. مەسەلەکە هەر ( نسبی ) یە .. و هەر یەکە بە جۆرێك لە دنیای پــر لە ژان‌و کــیەی شاعیر گەیشتوون .. ئیتر مەبەست ئەوەندە ئاشکراو روونێ .. بۆچی دەبێ لە پەناوە هێندە هەڵـەزودابەز بە شـــتەکە بکرێت .. کە لەگەڵ ئەوانــەش‌دا گومان نابەم .. تۆزێك چی‌یە بە لە جێ‌و شوێنی شاعیر .. لە مێژوو ئەدەبی کوردی‌دا کــەم بکاتەوە .. نووسەر ئەوەندە نابات .. دوا بــە دوای ئەو بێ ئاواتی‌یەی ، رایەکانی کە بۆ زیت‌و چەلەنگـی مامۆســـتا ( محەمەدی مەلاکەریم ) داینا بوو.. زۆر زوو لـــەویش پەشـــــیمان دەبێتەوە .. و دەڵێ :ـ ( کـــاك محەمەد لە پێشەکی‌یەکەدا بە بـــێ ئەوەی پێویستی‌یەکانی ئەم سەردەمە ناچاری بکات ، زیاد لە جارێك پوورە هەنگـــی مەسەلەیەکـــی ئاینی وورووژاندوە .. و جارێکی تریش کینـــەی نیوان تەریقـــەی قادری‌و نەقشبەندی زاخاو داوەتەوەو بـــێ پەرواش خۆی لــــە ڕێزی دووەمـــا داناوەو دارکاری هەڵگرانی تەریقەتی قادری کردوە ....... تـــا باس کردن و پیاهەڵدانی هەر کامێکیان چ سوودێك ئەگەیەنێ بـــە ئـــەوەی ئیمرۆ .... ) (١٣)

نووسەر چۆن ئەو مافەی بــە خۆی داوە .. گلەیی لە مامۆستا ( محەمەدی مەلاکەریم ) دەکات .. کە بۆچی جارێکی‌کەش پوورە هەنگی مەسەلەیەکی ئاینی وورووژاندوە .. بۆ ئێمەش هەیە بپرسین ئەی نووسەر بۆچی خۆی .. بە تایبەتی لەم کاتەدا وورووژانـــدۆتـــەوە ..و برینی سارێژبووی باسەکەی هێناوەتەوە سوێ‌و وەك دەڵـــێ ( باس کردن‌و پیاهەڵدانی هـــەر کامێکیـــان چ سوودێك ئەگـــەیەنێ بـــە ئەوەی ئیمڕۆ ) (١٤) .

ئێمە بمانەوێ‌و نەمانەوێ .. ئەو دوو تەریقەتە .. لە قوناغێکی تایبەتی مێژوویی‌دا چەکەری کرد .. پاشانیش وەك دیاردەیەکـی ئاینی‌و کۆمەڵایەتی .. بە پێویستی‌یەکانی زمان‌و ئەرکەکانی سەردەمی خۆیان هەڵساون .. ئینجا کامیان زیاتر یان کەم تر . ؟ خزمەت یان زیانی ، بە کۆمــەڵ گەیانـــدوە . ؟ ئــــەو پرسیارێکەو چاوەڕوانی وەڵامە !!

به براوی زۆر له شارەزایانی

تەریقەتەوە.. تەریقەتی نەقشبەندی لە چاو تەریقەتەکەی تردا .. لەو سەردەمەدا ، لە پێش تر بووە .. چونکە لەگومان‌دا نی‌یە .. ئەوانەی پەپوولە سووتاوی ئەو تەریقەتە بوون .. زۆرتا لەم ، لە چینە چەوساوەکانی میللەت بوون .. ئەو ساتە لەمەوە جیاوازی‌یە چینایەتی‌یەکە دەرکەووتووە .. جگە لەوەش ، ئەوانەی پێشڕەوی ئەم تەریقەتەیان دەکرد .. خاوەنی بەهرەو بلیمەتی و زانای‌یەکی لەبن نەهاتوو بوون .

خۆ لە ڕووی زۆر دارەکی‌و راودوونانی کەسانی بێ تاوانیشەوە .. چ گەورە شێخانی نەقشبەندی .. زیانی نامۆیی‌و ئاوارەی .. بەسەر شانی چەندان گەورە پیاوانی وەك :ــ ( مەولانا خالیدی شارەزووری ۱۷۷۷ ــ ۱۸۲۸ ) (۱۵) و ( موفتی زەهاوی ۱۲۰۸ هـ ــ ۱۳۰۸ هـ )(۱٦) و( حاجی قادری کۆیی ۱۸۱۵ ــ ۱۹۸۲ )(۱۷) هێناوە ؟!

کەوا بوو نەك مامۆستا ( محەمەدی مەلاکەریم ) .. بگرە هەر هەستیارێك شریتی رابووردووی ئەو دیمەنە مەرگەساتانە بخاتەوە یاد .. ئەبێ گیانی مرۆڤایەتی‌و بەزەیی بجولێ.. و لە ئاکاما خۆی لە بەرەی دووەم بزانێت !!. و لە کاتی پێویستیش‌دا بە دڵنیایی‌یەوە ، وەك هەقێك بەرگری لێ بکات ..

نووسەر هەر لە دەلاقە کراوەی ئەو باسەوە .. دێتە سەر سفت‌و سۆی ئازارێکی بەژان‌تر .. و زیاتر گۆمی روونی باسەکە دەشلەقێنێت‌و دەڵێ :ــ ( شیعرەکانی مەحوی دژی قادری‌یەکان و راو دوونانی مەحەی‌و کەسانی تر لە لایەن قادری‌یەکانەوەو هەموویان گری درابوون بە تاڵێکی گرژی تایبەتی ....... تا نە ئەبوو بە هەمان شێوە ئەم شالاوە بەرەو ژوورتریشی بگرتایەوە ؟ .. تۆ بڵێی « سولتان عەبدولحەمیدی عوسمانی » لەژێر پەردەی ئاینی‌دا راوی گیری‌دروستی نەکردبێ‌و دەستی بەئاینەوە گرتبێ. ئەی بۆچی پارچە شیعرێکی ئاوازەی بۆتەرخان کردووەو چەپڵەی سەرکەوتنی بۆ لێداوە ... یان بۆچی شاعیر ستایشی ( حەمە عەلی قاجاری ) کردوە .. کە پێشڕەوی فەرمان رەوا ستەمکارەکانی ئێران بووە(۱۸) .

راستێکەی بۆ ئەم رایەیان‌و بەتایبەتی رایەکی مامۆستا (محەمەد) رەنگە لە هەندێ شوێنیا ، رام لە گەڵیاندا جووت ببێتەوە .. ئەویش ئەوەیە کە نەدەبوو ، یەکێکی وەك مەحەی بەو جۆرە ببوایە ..

جارێ نابێ ئەوە لە بیر بکەین.. مەحەی دژی قادری ، وەك هەڵگرانی تەریقەت ، نەوەستاوەتەوە .. بگرە دژی هەندێ شێنمان ، کە بە ناوی قادری‌یەوە ، زۆرداوەکی و کاری ناڕەوایان کردووە .. بە تایبەت هەندێ لە شێخانی ناوچەی سلیمانی .. ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت .. کە سەرجەم شێخان دژی مەحوی وەستابنەوە .. ئەوەتا مەحوی شاعیر وا ( سەید ئەحمەدی نەقیب ۱۸٦۳ ــ ۱۹۰۹ ) کە گەورە شێخانی سلیمانی‌یە بەم پێیە دەلاوێنێتەوەو دەڵێ :ــ

**پەروازی جانە ، ڕۆینی جانانە وەرنە بۆچ(۱۹)**

**تۆ گۆرەوی لەبێ دەکەی‌و من لەدەست ئەچم**

**هەستانت ئەوقیامی قیامەت نیە چی‌یە ؟**

**بێ دەخلی چەنگ‌و نەی‌و مەی لەدەست ئەچم .**

سەرەڕای ئەوەش ، ئەبێ لەو سەردامەدا ، لەوە زیاتر ، چی لە مەحوی چاوەڕوان بکرابە ؟ !

بە شەرێك شاعیر خۆی بە خەلیفەی ئیسلامی دەزانی .. و لە لایەکی کەش سولتان فەرمان ڕەوایەکی گەورەی موسولمانان بووە .. من لێرەدا وا بۆ شتەکە دەچم‌و دەڵێم :ــ ئەگەر ئەو سەردەمەی شاعیری تیا ژیابوو .. شاعیر بهاتبایە بەرەنگاری سولتانی بکردایەوە .. ئینجا ئەوەیان لەبەر هەر هۆیەك ببوایە ؟ !

ئاخۆ نەك سولتان .. ئایا موسلمانی ئەو سەردەمە چی‌یان بە شاعیر دەووت ؟ ! لەلایەکی کەشەوە بۆچی ناڵێن :ــ کێ ئەڵێ مەحوی نەیویستوە لە پەنا سولتان‌دا ، دوژمنێکی کە مل نەشکێنێت .. ئەمانە هەمووی لە کاتێکدا بوون .. کە فەرمان‌ڕەوایی سولتان بە پیاوە نەخۆشەکە ( الرجل المریض ) ناو دەبراو .. لە ناوچەکەش‌دا ، تەنها قادری‌یەکان بۆ خۆیان بە کوژو بە بڕبوون .

بەڵام دەربارەی «حەمە عەلی قاجاری » خوێن رێژ .. من لەو بڕوایەدام مەسەلەکە زۆرتر لایەنە ( مادی )یەکە بگرێتەوە .. دوور نی‌یە محوی لەو کاتەدا ( فەقێکی ) هەژارو ئاتاج نەبووبێ .. کە بە شان‌و شکۆی « حەمە عەلی »دا هەڵداوە ..

سەرەڕای ئەوەش مەحوی کاتێ ئەو چوارینەی ووتووە .. ئەو سوپاهسالار بووە .. نەك لە سەڵتەنەتی پاشایەتی‌دا ..

خۆزگەشم ئەوەیە دەمزانی .. ئایا بۆچی لەناو هەموو شیعرە فارسیەکانیدا .. تەنیا پەنجە بۆ ئەو چوارینەیان راکیشراوە .. و ئیتر ئەوانی کەی فەرامۆش کراون . ؟ !

دیارە ئەم دیاردەیەش ، هەر لە کۆنەوە ، وەك (سیما)یەك بە ئەدەبی کلاسیکیەوە بووە .. ئێمە ئەگەر چاوێك بە مێژوو ئەدەبی کوردیدا بگێرین ..

دەبینین چۆن کاتی خۆی پەلار هاویشتن باوبووە .. هەر بەو پێوانەیەش پیاهەلدان بە کەسانێکی‌کەدا بووە ؟ ! ئەمانەش بێ‌گومان لە رواتگەی باری ئایدلوژیەتو بیری شاعیرو ئەو بارو زرووفەوە بوون .. کە شاعیری تیا خولقاوە ..

ئیتر مەبەستێك ئەوەندە ئاشکراو دیاربێت .. بۆ دەبێ تاوانی تەوقی عەزازیل بە تەنها بکرێتە ، گەردنی شاعیرێکەوە .. و چاویش لە شتەکانی رابووردوو بپوشرێت ..

جگە لەوەش کاتێ شاعیر دەزانێ .. « حەمە عەلی قاجاری » ئەوە هەڵناگرێ .. و ئاوانەکانی شاعیری بۆ نایەتەدی .. کە ئەم دیاردەیە پێچەوانەی هەموو شاعیرانە .. خێرا دان بە چەوتی هەڵویستی خۆیا دەنێت .. و لە رایەکەی پێشووتری بەم چوارینەیە پاشگەز دەبێتەوە :

**دو بیتیرا ، نمودم بهراین شهزادە**
**من تنظیم «(٢٠)**
**ندیم جواب او نەیك هدیە نەیك**
**تعظیم .**
**مگر این است ، تا حال این سپە**
**سالار محبوبان**
**بپیشش بشترا از شعر گشتە**
**هدیەها تقدیم .**

رەوشت جوانی شاعیرو نەفس پاکی‌و بێ هەوایی شاعیر لەوەدایە : کە ئەڵێ « حەمە عەلی قاجاری » ئەوە نەبوو من چاوەروانیم لێوە دەکرد .. لە جیاتی ئەوەی دەستی بە خشندەی‌والابێ .. کەچی بە پێچەوانەوە ، هەمیشە نووقاوە .. دیارە ئەمەش بێ‌بەزەیی بەولاوە چی کە دەگەیەنێت .. دوا شتێك لە بارەی ئەو نووسینەوە مابێ .. باری سەرنجی خۆمانی لەسەر دەربرین .. ئەوەیە کە دەڵێ : ــ گوایە نەدەبوو ( بو مێژووی ژیانی مەحوی ووتاری ــ ئاوەندە ئەدەبییەکی ئاڵۆزو ژیانی ئەدەبیمان(٢١) ــ ی وەك سەر چاوەیەك مامۆستا محەمەد سەیر بکردایە ....... تا تۆ بڵێی تەنها مەبەستی رازی کردنی سەرجەم ئەوانەبێ .. کە دوورو نیزیك پەیوەندی‌یان بە شاعیرەوە هەیە ....(٢٢) )

پێشەکی من لەو باوەرەدام.. بنەماڵەی شاعیر ، زۆر تاکەم .. یان لە ( دووروینزیکەوە وەك نووسەر دەڵێ(٢٣) ) .. وەك هەموو ئەدیبو ئەدەب دۆستێك بەو شاکارەی بنەماڵەی مامۆستا ( مەلا عەبدول کەریم مدرس ) قایل‌و کەیف‌خۆش‌ن .. بە تایبەتی من بەش بە حاڵی خۆم لەو رووەوە قەرزار باری‌یان دادەنیم .. ئیتر کارێك پێ‌شیاوی ئەوە بێت ..

ئەبێ مەبەست لەرازی کردنی ئەوانەی پەیوەندی‌یان بە شاعیرەوە هەیە .. چە مانا یەکی قوڵ‌و وورد بگەیەنێت ؟ !

بۆ ئەوە شیان گوایە نەدەبوو .. مامۆستا ئەو ووتارەی بە سەرچاوە دابنایە .. ئەوە پێش هەموو شتێك باسێکە .. و زۆرتر پەیوەندی بە مامۆستا محەمەد خۆیەوە هەیە..سەرەرای ئەوەش، ئەو سەرچاوانە ی ئێمرۆ بەلای نووسەرەوە .. بە سەرچاوەیەکی مەزن‌و رەسەن دەژمێرێت مەرج‌نی‌یە ، بەلای منەوە .. یان کەسانێکی کەوە ، بە سەرچاوەیەکی زیندوو دابنرێت ..

چونکە بۆ هەڵبژاردنی سەرچاوە ، بۆ هەر نووسینێك دەگرێت .. ئەبێ پێش هەموو شتێك .. جارێ پەیوەندی‌یەکی سەرومری بە باسەکەوە ببێت جگە لەوەش ، لەگەڵ باری بیرو رۆشنبیری رای نووسەری باسەکەدا بکونجێت ! !

من لەسەر باس کردن‌و لێدواندن لە مەحوی شاعیر..رەنگە زیاد لە (١٠) نووسینم ببێ .. دیارە ئەم نووسینەیانم زیاتر لەگەڵ هەستو ئەستی مامۆستا ( محەمەدی مەلاکەریم )دا یەکی گرتۆتەوە بۆیە بول بژێری نوسینەکانی کردوە .. و بە سەرچاوەیەکی باسەکەی داناوە ..

خۆ ئەوەشیان ناشێ‌بڵێ : ــ مامۆستا ( محەمەد ) ئەوەندە لە باری ئەدەبی‌و رۆشنبیری ئیرۆمان بچرابێ .. هەر لە خۆوە بێ ئاگا شتەکانی نووسیبێت ..

ئیتر لە کۆتایی‌دا دەڵێم : ــ هەموو ئەوانە بە هەر حاڵ .. مەحوی شاعیر چەوساوە بووە .. لەسەر هەمە زۆر ناهەقی لێکراوە.. دەبا لێ کۆڵەرەوەکان ، پێش هەموو شتێك ئەو رازانە پێش چاو بگرن.. و بە پێوانەی سەر دەمەکەی عادیلانە .. لە شاعیر بکۆڵنەوە ..

## پەراوێزەکان : ـ

١ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (٦٨) بغداد سالی ١٩٧٨ .

٢ ـ دیوانی مەحوی : چاپکراوی کۆری زانیاری کوردی بغداد سالی ١٩٧٧ لێکدانەوەو لێکۆلینەوەی مامۆستایان مەلا عەبدول کەریم مدریس و محەمەدی مەلا کەریم .

٣ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (٦٨) بغداد سالی ١٩٧٨ ل : ٥٥ .

٤ ـ دیوانی مەحوی : چاپکراوی کۆری زاناری کوردی بغداد سالی ١٩٧٧ .

٥ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (٦٨) بغداد سالی ١٩٧٨ ل : ٥٥ ، ٥٦ .

٦ ـ گۆڤاری برایی ژمارە (٦) بغداد سالی ١٩٧٠ ( چەند سەرنجێك دەربارەی شیعرەکانی مەحوی ) نووسینی کاکەی فەللاح.

٧ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (٦٨) بغداد سالی ١٩٧٨ ل : ٥٦ .

٨ ـ زۆر جار مامۆستا ( شیخ رەسولی تەکیەیی ) کە ئیمام و مدریسی ( خانم ) بوو لە هەلبجە ... و کە بە زاناو قسەزان و نوکتەچی .. ناوبانگی سەندبوو .. دەیووت : ـ خوا لێخۆشبوو ( سەید ئەحمەدی خانقا ١٨٧٠ ـ ١٩٥٢ ).. دەیگێرایەوەو دەیفەرموو گوایە لە کۆتایی گەلا ریزای عومری نالیدا .. هەندێ لە کوردەکان لە ئەستەنبول چەند پارچە شیعرێکی مەحوی ( چیبکەم .. چیبکا ... بۆچیە ) کەپێش شاعیر بە خەیالی هیچ شاعیرێکدا نەهاتووە .. پیشانی نالی دەدەنەوە .. جاریش بۆ مەزەی قسەکەمێك نالی دەجوولێنن .. ئەنجام نالی دێتە قسەو بە دەم سەر بادانێکەوە دەفەرمووێت : ـ ( سوپاس بۆ خوا وە خاخم روونە .. ئومێدم زۆرە شوێنم چۆل نەبێت .. ) .

٩ ـ فەوزی ناز ناوی شیعری شێخ ئەحمەدی شێخ غەنیبە .. شاعیر یەکێك بووە لە شێخەکان و بۆ ئاوریشمی شخەکانی بەرزنجە.. لە سالی (١٣١٠) ی کۆچیدا لە سیمانی لە دایك بووە .. گەلێ شیعری نایابی هەیە .. یەکێکە لەو شاعیرانەی بە ( مەحوی )یەوە سەر سامژ بووە .. تەنانەت هەندێ تخمیسی لەسەر شیعرەکانی شاعیرەوە هەلبەستوە ..

خوا یار بێت لە دەرفەتێکی کەدا دەیان خەینە روو لێی بلاو دەکەینەوە .

١٠ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (٦٨) بغداد سالی ١٩٧٨ ل : ٥٨ .

١١ ـ دیوانی حەمدی صاحێبقران : چاپخانەی ئەسعەد بغداد سالی ١٩٥٧ .

١٢ ـ دیوانی مەحوی : چاپکراوی کۆری زانیاری کوردی بغداد سالی ١٩٧٧ ل : ٥٤٧ ..... تا ٥٥٦ .

١٣ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (٦٨) بغداد سالی ١٩٧٨ ل : ٥٦ .

١٤ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو

١٥ ـ تکایە بروانە : شیخ معروف النودهی محمد اغال بغداد سالی ١٩٦١ .

١٦ ـ موفتی رەهاوی : شێخ محمدی خال چاپخانەی مەعاریف بغداد سالی ١٩٥٣ .

١٧ ـ حاجی قادری کۆیی : چاپکراوی کۆری زانیاری کوردی بغداد سالی ١٩٧٦ مسعود محەمەد

١٨ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (٦٨) بغداد سالی ١٩٧٨ ل : ٥٦ ، ٥٧ .

١٩ ـ دیوانی مەحوی : چاپکراوی کۆری زانیاری کوردی بغداد سالی ١٩٧٧ ل: ٣٤٢ .

٢٠ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ل ٥٣٧ بەشی فارسیەکەی .

٢١ ـ ( ناوەندە ئەدەبیەکی نالۆزو زیانی ئەدەبیمان ) سۆران مەحوی پاشکۆی عیراق ژمارە (٢) ٢١ـ٤ـ١٩٧٧ .

٢٢ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە (٦٨) بغداد سالی ١٩٧٨ ل : ٥٨ ، ٥٩ .

٢٣ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو . ●

---

خوێنی سەرکردە بە سەرکردایەتی کردنی
هەڵمەتی گشتی نیشتمانی لە ناوبردنی
نەخوێندەواری تیۆری سەرکەوتنەکانی
خۆی خستە پێش .




**سەرەتایەك**

سەمەد ئاغا ئوغلی لە ساڵی ١٩٠٩ لە ئەستامبول هاتۆتە دنیاوە ، بنەماڵەکەی لە تورکەکانی ( ئازەربەیجانە ) لە تورکیا نیشتە جێ بون ،

ئەحمەد ئاغائوغلی باوکی لە پیاوەناودارەکانی زانستو سیاسەت مەندی تورکیا بووە .

سەمەد کۆلیجی ( حقوق )ی لە ئەنقەرە تەواو کردوەو پاشان چۆتە زانکۆی ( ستراسبورج ) بەو نیازەوە خویندنی بالاتر تەواو کات ، بەڵام لە ساڵی ( ١٩٣٢ )دا پێش ئەوەی نامەی دکتورا تەواوکات ناچار بووە بگەرێتەوە بۆ تورکیا تا ، ئەرکی بەخێوکردنی خێزانەکەی بگرێتە ئەستۆی خۆی .

لە گەلێ کارو فەرمانی میریدا کاری کردوە ، پاشان دەستی لە ( وەزیفە ) هەلگرتوەو خۆی بە کاروباری پارێزەر ) یەوە خەریك کردوە . هاوبەشی لە ( پارتی دیموکرات )دا کردوە ، لە ساڵانی ١٩٥٠ وە تا ١٩٥٧ بۆ سێ خولی ئەنجومەنی میللی هەلبژیردراوەو بووە بە نوێنەری ( مانیسا ) .

لە سەردەمەکانی ( پارتی دیموکرات ) دا بۆ چەند جارێك تەختی وەزارەتی پێ سپێردراوە ، ژیانی ئەدەبیشی لە ساڵانی دوایی قوتابخانەی ئامادەییەوە دەستپێکردوە ، خۆیو چەند هاوریەکی گوڤارێکی ئەدەبیان ( لە ساڵانی ١٩٢٩ ـ ١٩٣١ ) لەژێر ناوی ( هەردەم لاوان ! ) دەرکردوە ،

سەردەمەکانی خویندنی لە ( ستراسبورج ) کارێکی باشیان کردۆتە سەر گەشەسەندنی ژیانی لە ساڵەکانی (١٩٣٣) وە چیرۆکەکانی لە گۆڤاری (دارلگ)دا بلاوکردۆتەوە، ئەم گۆڤارە دەورێکی باڵای لە رێ خۆشکردن بۆ بلاوکردنەوەی نموونەی ئەدەبی هاوچەرخی تورکیدا گێراوە .

هەرچەندە کاروباری رامیاری تا رادەیەك مەودای ئەوەیان نەداوە سەمەد ئوغلی یەکجارەکی خۆی بۆ ئەدەبو هونەرەکەی تەرخان کات ، بەڵام بەوەیشەوە هێشتا نەیان توانیوە وای لێبکەن بە یەکجاری لەکارە ئەدەبیەکانی دابڕێت .

تا ئێستا پێنج کتێبی لە بابەتی کورتە چیرۆكو بیری راگوزاریدا بلاوکردۆتەوە ..

کتێبیکی تری بە هاوبەشی خۆیو خوشکیکی لەژێر ناوی « رۆڵە گوناهبارەکان مان»دا بلاوکردۆتەوە. ئەنجامی ترس یەکێکە لەو کورتە چیرۆکانەی چیرۆكنوس سەمەد ئوغلی .

( ١ )

دەوربەی نیوە شەو بوو کە لە کۆبوونەوەکە هاتنە دەرێ،ئاسمان هەورێکی باراناوی دایگرتبوو ، ئەو جۆگەلە ئاوەی چەند هەنگاوێ لە دەرگای ماڵەکەوە دووربوو ئەتووت ( فەروە ) یەکی ڕەشی قەترانیبە و بەو شەوە ئەکشێ .

هیچتروسکایەك لە ماڵەکانەوە بەدی نەدەکران . بە جووتە لا رێگای قورەچلپاویەکانی نزیك شوستەکەیان گرتبوە بەرو پیا ئەرۆیشتن ، هەر هەنگاوێکیان دەنا سێ بەشی قاچیان لە ناو قورەلیتناویەکاندا نقووم دەبوو ! جار بە جاریکیش لە نزیکانێکەوە دەنگی (شاور)ێك تێکەڵ بە وەڕینی سەگەڵ دەبوو ، لە پرێکا تارمایی دوو زەلام لەوبەری کۆڵانەکەوە دەرکەوت ، ناچار کشانە دواوەو خۆیان لە پەنا دیوارێکی نزیکدا شاردەوە ، بۆ ماوەیەك وەستانو نقەیان لە خۆیان بری ، تا دور زەلامەکە بە تەواوەتی لەبەر چاو وون بوونو تربەی پێیان ئەما !!

فزەیان لێوە نەهات تا یەکجارەکی شەقامە سەرەکیەکەیان بە تەواوی بری ، ئینجا وورد ووردو زۆر لەسەرخۆ ملی ریگاکەیان گرتو

لەبەر دەمی (سەرا) كەدا ئێستیكیان بۆ كرد ، لەپڕ بەكێكیان رووی كردە هاورێكەی :

— ئەڵێی ئەلەرزی ! .

— منیش وەك تۆ

— سبەینێ چاومــان بەیەكتر دەكەویتەوە

— كێ ئەڵێ ؟

تێر دەستی یەكتریان گوشیو بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن لەیەكتر دابڕان

— « كێ ئەڵێ .. كێ ئەڵێ ؟ »

« سبەینێ چاومان بە یەكتر دەكەوێتەوە » ئای لــەم قســه قۆڕانە ! .

ئەوی ئەم قسانەی لەبــەر خۆیەوە دەكرد كابرایەكــی لاوازی بچكۆلانەی قژ زەردبوو ، لە قووڵایی چاوە شینەكانیەوە تروسكایی ترس بەدی دەكرا ، ئاوورێكی دایەوە بینی وا هاورێكــەی وورده وورده دوور دەكەوێتەوە ، لە دوورەوە باڵا بەرزە لاوازەكەی وەك شتێكی عەنتیكە هاتە بەرچاو .

جارێكی تر لەبەر خــۆیەوە ووتی :

رەنگە قەت چاومان بە یەكتر نەكەوێتەوە ، كێ ناڵێ دیمەنی ئەمشەو و تیشــكی ئەم رۆ شنایانەی ئەم شەقامە پانو پۆڕە دوا یادگاری بینینمـــان نابێ ؟ ! .

لە پڕ هەستی كرد ماندوێتی زیفی لێ سەندوە ، بوێــە بــە زەحمەتێكەوە هێزی دایە بەر خۆیو چاوی بۆ شوێنێك گێڕا تا پاڵی لێ باتەوەو كەمێ لە شی شەكەتــی بحەوێنێتــەوە ، لە نزیكــەوە قەنەفەیەكی تەختەی بەدیكرد بــێ سێو دوو تەخت لەسەری راكشا !

— تۆ بلێی ئــەم كارەمــان سەربگرێ .. ئەی ئەگــەر سەری نەگرت .

مو چوڕكێكی سارد لە دەفەی شانیەوە هەڵساو لــە قوولەپێیەوە چووە دەرێ ، ئینجا دەستی كرد بە باخەڵیاو گوریسێكی شــی داری دەرهێنا .

— تازە خۆ ئێمە لــە یــەكتر وونبووین ، هەر چۆنێ بێ ئەم كارەی دەستمان داوەتێ ئەبێ بیبەنە ســەر ، ئەوســا ئەو ژیانەی ئێمــە دەمانەوێ ســەر لــەنوێ لــە دایك دەبێتەوە ..

— ئــێ باشــە ئــەگــەر سەرنەكەوتین ؟ ! بە ترسێكەوە سەیرێكی ئەم لاو ئــەو لای خۆی كرد ، كەسی بــەدی نەكرد ، ..

تازە ژیانی لە دەست چــوو بوو ، هیچ هیوایەكی بەم دنیایــە نەمابوو ، لەو بڕوایەدا نەبوو جارێكی تر هیچ شتێ بە دەمیەوە پێ بكەنێ!.

— باشتر وایە بیر لــە هیــچ نەكەمەوە .. پیاو چی لە ناو چەواندا نووسراــێ هــەر ئەوەیە . چــاوی نووقان ، ویستی كەمێ خۆی لــە بــیر بچێتەوە ، چەند چركەیــەكی نەخایاند وای زانی چەنــد سەعاتێكی بەسەر بردوە ، لە ناكاوێكا راپەڕیو دیسانەوە لەبەر خۆیەوە ووتی :

— ئــەی ئەگــەر كــەوتینە داوەكەوە ؟

وەكو یەكێ لــە تەنیشتیەوە بچرپێنێ بە گوێیا :

— » نا .. نا .. نابێ وا بــیر بكەیتەوە

— ئەڵێی (شەیتان) تێك بەگوێما دەچرپێنێ ، ئەم كارەمان سەر ناگرێ .

مەسەلەی بیر كردنەوە لــە ( شەیتان ) هینایە پێكەنین !

— مێشكم ماندوە ..

لە پڕ وای هاتە بەرچاو،كەدوو چاوی زەقی ئاگراوی لــەو بەریــەوە ئەبریقێنــەوە ، لـــــە جــێیەكــەی خۆی ڕاپەڕی كلپەو گــڕی چاوەكان وون بوون ، لــە پشتەوە گوێی لە دەنگە دەنگی پێبوو ، سەری وەرچەرخاند ، سەرخۆشێك بــو لیتری‌ئەدا بەرەو ڕووی هات ، لە دلــی خۆیا ووتی :

— وا دیارە ئەگبەت ! تویش دوا شەوی عەمرتە !

— مەرگ ، مەرگ ، مەرگ زیاد لە ســەد جــار ئــەم ووشەیەی دووپات كردەوە

— مەرگ لە پێناوی چییا ؟

— لە پێناوی بیریكدا، لە پێناوی بیرێكی راستو بێگەرد دا ..

« خۆی شەڕی ژیانو مردنە ئێمە پیا تێ ئەبەرین .. ئەنجامیش سەركەوتن هەر بۆ ئێمەیە .. » . هەموو چەند سەعاتێكی تر ناخایەنێ بە بێ ( دادگا ) ســێدارەت بــۆ هەڵدەخەن ، ئەی تۆ خــۆت ناڵیی شەڕی ژیانو مردنە ، چیی تیایە شەهید ئەبیو سەربەرزیش هەر بۆ شەهیدانە .. وا نییە ؟ ..

« ئای لەم قسە پڕوپووچانە ! ژیانی ئەمری چیی ؟ ئەگەر پیــاو ئێسكو پروسكی ببێ بە خۆڵ ! »

« تازە كار لەكار ترازاوە،لەێ رۆكرێ چۆن هەڵ ئەگیرێتەوە ! »

« بە تۆ چی ئەگەر مەبەستەكەیشت

پیکا تۆ هەرچیەك بی ، بتەوێ و نەتەوێ دارەستێکی‌و هیچی تر ! ».

« نا .. نا من دار دەست نیم .. من بۆ بەدی هینانی بیروباوەڕی خۆم هاوبەشیم لەم کارەدا کردوە » .

کزەبایەك هەڵی‌کرد ، درەختەکانی راوەشاندو باڵندەکانی بەسەر لقو پۆپەکانەوە راچڵەکاندو چەند گەڵایەکیش هەڵوەرین‌و کەوتنە خوارەوە .

« سبەینێ تۆیش وەك ئەم گەڵا داڕانە هەڵ ئەوەریت‌و لاشەکەت بە دەم کزەباوە ئەلەرێتەوە » .

لەبەر خۆیەوە ئەم قسانەی ئەزرکاند ، وای زانی ئەم رستەیەی دوایانی‌بە دەنگێکی بەرز لە دەم دەرچووە ، .

« وەرەوە سەر خۆت ، زۆرت بە بەرەوە ماوە ئەگەر بتەوێ ! »

« ئەگەر بتەوێ .. رزگارت دەبێ‌و ژیانت سەر لەنوێ بۆ دەنوسرێتەوە ، ژیانێکی پڕ لە خۆشی‌و رابواردن ، سەرەتای ژیانیکی رەنگاو رەنگی پڕ لە رۆشنایی و غەلبە غەلب ، بە خەویش ئەم چەشنە ژیانەت بە خۆتەوە نەدەبینی ! » .

لە پڕ داری قەنارەکەی هاتە بەرچاو،خۆی وا بینی لە ناوەڕاستی سێ پایەی قەنارەکەدا دەستاوەو گوریسەکەی خراوەتە مل .. رەنگی هەڵبزرکاوەو زمانی لە نێوان دانەکانیەوە وەکو پارچە گۆشتێکی ئاوساو دەرپەڕیوە ! .

راچڵەکی‌و چاوی خۆی نووقان.

« ئای ! ئەوە ئەترسی ؟ راکردن بە دوای بیروباوەڕی بۆش‌و گوم ڕادا چ دادێکت ئەدا ، روانە راستیەمەزنەکان چۆن بەرەو پیرت دێن .. جوڵانەوەیەکی بچکۆلانە ، هەر خۆبەخت کردنێکی بچکۆلانە ئەم پەردە رەشە وەکو شەو لەسەرتاپای ژیانت دا ئەماڵێ ! »

« بەڵام ئەم جوڵانەوە بچووکە چی‌یە ؟ باشە چی‌ی بکەم ؟ »

« سەیرکە .. لەو بەرەوە ئەو ( مەخفەرە ) ئەبینی »

لە جێگاکەی خۆی راپەری وەك بیەوێ قورتمی زەلامێك بگرێ و شالاوی بۆ بەرێ .

من‌و ناپاکی نا من‌و بە دەستەوەدانی هاورێکانم ، مستێکی کێشا بە سەری خۆیا ، نابێ بیری وام هەر بە خەیاڵدا بێت ! .

ئینجا لە پڕ خۆی وا هاتە بەرچاو ئەگەر هاتو ریگای دووەمیانی بۆ خۆی هەڵبژارد چی بەسەر دێ بێ‌گومان ئەوسا جل‌و بەرگی نوێ ئەپۆشێ و پێلاوی بریقەدار لەپێ‌ئەکاو گیرفانەکانی هەمیشە بە پارە دە ئاوسێن‌و هەر ئەوساش بەسەر شەقامە پان‌و پۆرەکاندا دێت و دەچێ و خەڵکەکەش لەتر سانا رێزی لێ‌دەگرن ، بەڵام هەر ، کە دەگاتە ئاستیان دەستە دەستەو کۆمەڵ کۆمەڵ رووی لێ وەردەگێڕن‌و لێ‌ی دوور دەکەونەوە! دەیەوێ قسەیان بۆ بکات بەڵام خەڵکەکە وەك کەڕو لاڵ نقەیان لێوە نایەت ! .

« وا بیر نەکەیتەوە .. نەکەی وا بیر بکەیتەوە ئەگەر وا تێ بگەی بەو چەشنە هاو زمانەکەت دەورو خولت بدەن هەر وەك دەورو خول دانی پەپوولە بە دەوری چرادا ئەوا تا بلێ‌ی بە هەڵەدا چوویت ! » .

لە پڕ گوێ‌ی بە قاقایەکی ترسناك زرنگایەوە ، کە ئاوڕی دایەوە هیچی نەبینی ..

« خۆت چۆنت دەوێ وا بکە .. بەڵام من لەم کارە دەکشێمەوە » .

هەستی کرد هەر خۆی بە تەنیا ماوەتەوە ، وەك بەڕاستی ئەوی تەنیشتی لێ‌ی کشابێتەوە، هەڵسایە سەر پێ‌و بە ڕاکردن ڕێ‌ی ماڵەوەی گرتەبەر ، لەسەر پەیژەکانی ماڵێشەوە هەر هەنگاوێکی کرد بە دووان ، چووە ژوورەکەی خۆی‌و دەرگاکەی لەو دیوەوە لەسەر خۆی داخست ، لەناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستاو بە هەر دوو دەستی دەم و چاوی داپۆشی ، غەڵبە غەڵبێکی هاتە بەرگوێ ، گوێ‌ی زیاتر هەڵخست دەنگی تەختەو تەقەی چەکوشی بەر گوێ دەکەوت ، چاوی کردەوە تارمایی ریزێ لە هاورێکانی خۆی بەرچاو کەوت لەگەڵ تیشکی تاڵێکی سپی‌و باریك لە پەنجەرەکەوە خۆیان دەکرد بە ژوورەکەدا ! .

دیسانە لە قووڵایی شەوگارەوە دەنگێکی هاتە بەرگوێ :

« هەمووی سەعاتێکی ماوە .. تەنها یەك سەعات ، دوای ئەوە ئیتر تاریکایی ئەبەدی هەڵ دێت .. هەنگاوی نا ، بەرەو دەرگاکەو ئەڵقەرێزەکەی کردەوە و دەرگاکەی بە دوای خۆیا خستە سەر پشت ، لەو کاتەدا داڵانەکەی زۆر بە دوورو درێژ هاتە بەرچاو ، چاوی هەڵبڕی تارمایی لاشەی هاورێکانی بەدی کرد وان بە پەتی قەنارەکانەوە ئەلەرێنەوە و زەق زەق چاویان بریوەتە ئەم ! . رای کردەوە بۆ ژوورەکەی‌و دەرگاکەی داختەوە ، بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات پشتێنەکەی لە پشتی کردەوەو چووە سەر کورسی‌یەك سەرێکی پشتێنەکەی بە بنمیچەکەوە بەستەوەو سەرەکەی تریشی لە ملی خۆی ئاڵاند ، ئینجا سووکێ شەقێکی لە کورسی‌یەکەی ژێر پێ‌ی خۆی

هەڵداو هەر ئەوەندە هەسی کرد ملی دا دائەتەکێو گەرمایسیەك سەرتاپای دەمو چاوی دائەگرێ .. ئەمە دوایین هەستیبوو پێی مابوو ئیتر بە یەکجارەکیماڵئاوایی لەژیان کرد ! .

( ٢ )

لەو لایشەوە کابرابالا بەرزەکەی تر ، کە لەبەر دەمی(سەرا) کەدا لە هاورێکەی جیا بۆوە ، هەر وەکو ئەو لەبەر خۆیەوە کەوتە لێکدانەوە

« باشە بۆ ئێمەی ترسنۆکیان بۆ ئەم کارە هەڵبژارد ؟ ئەوەتا ئێمە هەردوکمان رەنگمان زەرد هەڵگەراوە ئەوە نەبوو هەردوکمان هێزی ئەوەمان تیا نەمابوو توند دەستی یەکتر بگوشینو باوەش بە یەکتردا بکەین ، کاتێ سەر لە ئێوارە لە یەکتری جیابووینەوە » .

ئینجا شانێکی هەڵتەکاند ..

« لەبەر ئەوەی ترسنۆك بووین بۆیە ئەم کارەیان بەئێمە سپارد ، دڵنیام تیایشیا سەرناکەوین ئەبێ دان بەوەیشدا بنێم ژیان خۆشە ، رەنگە سبەینێ ئەم وەختە بەسەر ئەم دنیایەوە نەمێنم » .

« بۆ دەستم دایە ئەم کارە ؟ چیم دەست ئەکەوێ ؟ »

ئەوە چیتە ؟ ئەم بێ ورەیەت لەچی ؟ هەروەکو یەکێ لە تەنیشتیەوە بڕواتو ئەم قسانەی بۆ بکاتئەمیش لە داخانا توند لێوی خۆی بە یەکەوە نووساند .

« ترس و لاوازی!ئەمە هەموو کەسێ لە ناوچەوانی نەنوسراوە ! .

سبەینێ خۆر هەڵدێ ، لاشەکەم بە پارچە پارچەکراوی بەسەر زەویدا رائەکێشن »

« رەنگە وایش بێ ، جا چیی تیایە خۆ تۆ لە پێناوی بیروباوەڕێکی پیرۆزدا دەمری ! »

« مردن لە پێناوی بیروباوەڕدا کارێکی پەسندە بەڵام چ سوودێکی منی تیدایە ؟ .

« بەهەر حاڵ تازە خەنجەرێ لە کێلان دەربهێنرێ شوورەییە بخریتەوە جێی خۆی ! تازە هەر ئەبێ ئەم نامانجە ببەمەسەر قیروسیا چیش ئەبێ با ، ببێ !

هەر لەم کاتانەدا ئوتومبێلیکی تازە مۆدێلی جوان بەلایا فڕکەی کردو کۆمەڵێ ئافرەتو پیاویشی تیابوو هەموو باوەشیان کردبوو بە یەکداو قاقایان دەگەیشتە کەشکەلانی فەلەك ! .

هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا

« ئەمانەیش ئاوا ئەژین ! »

« هەر چەندە دەمێکە دڵم بۆ ئافرەت و خواردنەوەو ئوتومبێل لێ نەداتە! »

بە خەیاڵ خۆی هاویشتە ریزی یەکێ لەو پیاوانەی ناو ئوتومبێلەکەوەو وردە وردە دەستی بەناو لەشە گەرم ونەرمەکانی ئافرەتەکاندا گێڕا ..

« ئای کە گۆڕانێکی سەیرە ! »

هەستی بە لەزەتێکی خۆش دەکرد کاتێ لەبەر خۆیەوە ئەم قسانەی دەکرد .

« بۆ دواجار ئەم شارە دەبینمەوە ، ئای چەند دڵنیابوم ، تۆ بڵێی جارێکیتر دڵنیا ببمەوە ؟ » .

« لە هیچە خۆم خستە ئەم داوەوە هەف نەبوو لەم کارەدا بەشداری بکەم » لە گەڵ ئەم هەموو بیرکردنەوەیدا هەستی بە ترسێکی مەزن دەکرد ، هەموو لەشی بەجارێ هاتبوە لەرزینو جۆقەی بێکەوتبوو ، وای هەست دەکرد هەردوو دەستی بوونەتە پارچەیەك سەهۆڵ و مەیوون !

« نەدەبوو لەم کارەدا بەشداربم کردابە ، هەف نەبوو هیچ کلۆجێ لەم کارەدا بەشداربم » .

« ئەمکرنو تێرو پڕم لێ دەدەنو لەشم وونجر وونجر دەکەن ! »

وەك لە دواوە یەکێ ڕاوی بنێ بۆیە کوڕی دایە خۆیو تاهێزی تیدابوو ڕای کرد ، کە ئاوڕیشی دایەوە کەسی بە دواوە نییە ، نەوەستا ، زیاتر تاوی بەخۆی دا .

« بۆ کوێ دەرباز دەبم ؟ هەر ئەملۆزنەوە »

« دەرباز بوونم بۆ نی یە »

« ئای چەند کابرایەکی کەوجم ! »

سەیرێکی ئەم لاو ئەولای خۆی کرد .

— یەك ڕێگات لەبەرە ، ئەتوانی بیگریتە بەر

« تازە خەنجەر لەکێلان دەرهاتوە ، هیچ هیوایەکم بە دەستەوە نەماوە ، خۆیشمو هاورێکانیشم تازە کەوتوینەتە داوەکەوە »

« رەنگە هاورێکانت لە پێناوی تۆدا کەوتبنە داوەکەوە ، بەڵام تۆ ئەتوانی خۆت رزگار بکەیت » .

« ئەمەیان ڕزگار بوونێکی ناشایستانەیە ! »

« بەڵام ژیان سەرەڕای هەموو نالەباریەکیشی هەر خۆشە ! »

« ژیان هەر چۆنێ بێ هەر ژیانە » .

ئەیزانی کام ڕێگابۆ(مەخفەرە)کەی نزیك ئەفاتەوە ، بۆیە وردە وردە ملی ئەو ڕێگایەیانی گرتەبەر و بێ ئەوەی بیر لە هیچ شتیکیتر بکاتەوە بەرەو ئەوێ ملی نا ! .

# ژانەکانی مرۆڤ لە «بابانوئێل تۆراوە»دا

• حسن جاف •

ئەگەر بمانەوێ ئەدەب وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دیاریبکەین « هەروایشە » دەبینین نووسەر هەمیشە لێپرسراوە بەرامبەر هەموو شتێك و دیاردەیەك کە لە کۆمەڵەکەیدا روودەدا، چونکە ئەدەب بەشێکە لەو جموجۆلیە کۆمەڵایەتیو سیاسییە کە ئەو کۆمەڵە خۆی تیادا دەنوێنێ و بوونی خۆی دەسەپێنی ، لەدوایشدا دەبێ بە بەشێ لە مێژوو و کەلەپووی میللی « ئەگەر راستگۆبی » ، ونەوەکانی دوارۆژ کە لاپەڕەکانی هەڵدەدەنەوە شوێن وهۆی ژانو ئازارەکان ، سەرکەوتن وتوشوستیەکان ، دەسنیشان دەکەنو باری راستەقینەی ئەو کاتو چەرخەی ئەدەبەکەی تیا نووسراوە دەزانن ، بەڵام ئەگەر ئەو ئەدەبە راستگۆ نەبوو ولەگەڵ خۆیو لەگەڵ نەتەوەکەیا درۆی کرد ، بەنجەی تاوانبار کردنی لە رووداو بەرز دەبێتەوە ، ووەکو ئەدەبێکی تارەسەن سەوداو مامەڵەی لەگەڵدا دکرێ . سارتەر دەڵێ ئەرکی نووسەر

تەنکیە کردنی ئازادیە و ئاخاوتنە لەگەڵ ئەو ئازادییەی هەمیشە لەم جیهانەدا هەڕەشەی لێ دەکرێ ، کەواتە . ئەگەر ئەمە مەبەستی نووسەربێ، هەمیشەو هەرگیز لێپرساوە ، بەرامبەر سەربەستیی مرۆڤ » (١) لە دوایدا دەڵێ « ئەوەی پێویستە ئێمەی نووسەر خۆمانی لێ بپارێزین ئەوەیە ، ئەم لێپرساویە نەبێت بە تاوانبار کردن و لەدوایدا ، پاش بەنجا ساڵێك دەربارەمان بڵێن ، چاوی خۆیان گەورەترین کارەساتی ئەم جیهانە یان بینی روویدەدا ، لەگەڵ ئەوەشابێ دەنگ بوون »(٢)

( بابانۆئێل ) لە گۆشەی هەستکردن بەو لێپرساویە ، وخۆپاراستی لەو تاوانبار کردنەوە نووسراوە . پاڵەوانەکانی لەگەڵ سەربەستیدادان و خۆشیان دەوێ (٣) ر هەمیشەو لەژێر هەر یارو زروونێکدا سەنگەری سەربەستی مرۆڤو هەست کردن بە ئێشو ئازار و هیواو ئاواتەکانی چۆڵ ناکەن. جۆرج ئاماوۆ نووسەری بەناوبانگی بەرازیلی لە چاوپێکەوتنێکا لەگەڵ گۆواری ( زارو بیچوم ) ی سۆڤیەتیدا کە لە گۆڤاری (الاقلام)دا بلاوکرایەوە دەڵێ « من بڕوام بە تەنها یەك شت هەیە ئەویش ئەوەیە ، ئەگەر نووسینەکانی نووسەر زیندووبنو دڵی گەل تیایاندا لێبدا و خوێنی گەل بە دەمارەکانیاندا ڕوا ، ئەگەر گەلڕاین لە تێکۆشان و خۆشو ناخۆشی دا ، ئەو جۆرە نووسینانە هەرگیز لە بیر ناچنەوە تەنانەت پاش سەدان ساڵیش » (٤) .

بابانۆئێل لەگەڵ مرۆڤ دایە ، دەکو ئاوێنەیەکی راستگۆ توانیویەتی خەمەکانی مرۆڤی کورد بکرێتە ئامێزی خۆیو لەگەڵ هیواو ئاواتەکانیا بجمێ و زۆر جاریش تەکان بداتە خۆی ، بۆیە دەتوانن بە ئاسانی چەن هێڵێکی گشتی بدۆزینەوەو وەکو دۆخێك «محور» رووداوو پاڵەوانەکانی بابانۆئیلی لە دەور کۆبکەینەوە .

یەکەمیان : (بابانۆئێل ) لە سەنگەری مرۆڤی چەوساوە و زۆر لێکراودایەو دژی چەوسێنەر وزۆردار بێ کۆڵدانو دوو دڵی دمجەنگێ . پاڵەوانەکانی لەو مرۆڤە ناوداڕو بەناوبانگانە نین کە هەموو کەسێ

دەیانبینیو دەیانناسێ بەڵکو وەکو فرانك ئۆکۆنۆر لەکتێبی ـ الصوت المنفرد ـ دا دەڵێ « مرۆڤی نەناسراون » ، ئەو کەسانەیە من و تۆ و سەدان کەسی تر بەلایاندا تێدەپەڕین بێ ئەوەی ئاوڕیان لێ بدەینەوە ، بەڵام کە چاوی تیژی هونەرمەند دەیاندۆزێتەوە و دەیانخاتە پێش چاومان واقمان وڕدەمێنێو بەسەر سامیەکەوە دەڵێین : تۆ بڵێیت ئەمە وابێ ؟ ئەی ئێمە بۆ نەماندین !!

دوومیان : (بابانۆئێل) شەیدای راستی و راستگۆیە ، راستی وەکو هەڵوێست ، وەکو رەوشت ، ئەم سیفاتانەی لە جیهانی ئەمرۆدا نەکو وەکو مرواری بە دەریا کەمو دەنگەن ، بەڵکو ئەو کەسانەی بۆشیان دێڵن دەکەونە بەر تیرو توانجی خەڵکیو گاڵتەیان پێ دەکریو بە شێت دادەنرێن و گوایا بەدوای کڵاوی بابردوو کەوتون .
سێیەمیان : لەبەر ئەوەی سیفاتی راستیو راستگۆیی ، ئەرکێکی گرانە و هەموو کەسێ ناتوانێ پێی هەڵسێو خۆی لە قەرەی بدا مەگەر یەکێکی ئازاو نەترس ، کە گیانی لەسەر دەستی دانابێ ، دەبینین ئەم جۆرە مرۆڤانە لە هەموو کۆمەڵ وولاتێکدا کەمایەتین ، بۆیە پاڵەوانەکانی ( بابانۆئێل ) یش تەنیان و گەلێ جار بێ دالدەو بێ پاڵپشتمە ( یا بارکیان مردوە یا دایکیان ) ، بە تەنها خۆیانو چەکی باوەڕیان رووبەرووی زۆرداری و بێ ئەمەگی ، و لە دوایدا بێ باریو بێ باکی خەڵکە کە دەوەستن .
چوارەمیان : ( بابانۆئێل ) نایەوێ مرۆڤ بە تەنیا بێ لە ژانو خەباتا ، چونکە هەرچی چەنێ ئازاو راستگۆبێ ، هیچی بۆ ناکرێ ئەگەر کۆمەڵەکەی لەگەڵدا نەبێ ، بۆیە بە توندی ئەو کۆمەڵە بێبار و بێ ئەمەگە تاوانبار دەکا و نارەزایی خۆی دەردەبڕێ بەرامبەر دوورەپەرێزیی خەڵکەکە د خون هەڵخەڵەتاندنیانە بەوەی گوایا دەتوانن دەس بە کڵاوی خۆیانەوە بگرنو خۆیان لە کارەساتی ژیانو چەپۆکی رۆژگار بپارێزن . ئەم جۆرەکەسانە لە هەمو کات و لە هەمو کۆمەڵێکدا هەن ، جا کە چەپۆکی رۆژگار ئەوانیشی داپڵۆسی ئەو سا پەنجەی پەشیمانی دەگەزن و خۆزگەو ئاوات ئەخوازن بەوەی ئەگەر رەورەوەی مێژوو بگەڕایەتە دواوە ئەمجارەیان وا نەدەبوون ! ، بەڵام کەی رەورەوەی مێژوو گەڕاوەتە دواوە ؟ بەڵکو هەمیشە لەبەرمو پێشوە جوندایە و هەموو ئەوانەش بەجێدێڵێ بۆئازاری ویژدانو چرنوکی پەشیمانی .

لەچاو بێ کە وتنێکا کە لە رۆژنامەی ( عیراق ) دا بڵاوکرایەوە کاك عەبدوللا بەم جۆرە باسی پاڵەوانەکانی خۆی دەکا«پاڵەوانەکانم لەپێش مەرگەکانی فەلەستین دەکەن ، مەسەلەیەکیان هەیەو خۆنانی لەپێناودا بەخت دەکەن ، مرۆڤ پەروەرو نەتەوە پەروەرن لەهەمان کاتدا و ئازادییان خۆش دەوێ، وزۆرجاریش سەربازی نەناسراو دەبن » (٥) .

« مرۆڤ » ەکانی بابانۆئێلیش زۆرلێکراوو چەوساوەن ، بەڵام ئازاونەترسن روونبینو کۆڵنەدەرن، هەمە بارێکدا لایەنی چەوساوەکان بەر نادەن ، چونکە خاوەن مەسەلەیەکن و ئامادەن خۆیانی بۆ بەختبکەن . هاوبەشی ئێشو ئازاری خەڵکن « لەتەکیاندا ملی رێگای گرت تا لە دەربارەی ئازارەکانیاندا بژی » (٦) . بەڵام ئەم مرۆڤە راستگۆیە ( وەکو هەموو مرۆڤێك لەهەر لایێكو هەر کۆڵێکدا ) ، کە راستیدەر دەخاو پەنجە دەخاتە سەر شوێنی ئازارەکان و هەوڵی دۆزینەوەیان دەدات،گاڵتەی پێدەکرێ و خەڵکەکە خۆیانی لێ هەڵدەکەنو بە شێتی دادەنێن « نەبێت خەڵکەکەتێم بگەن .. وەك خۆم خۆم نەناسم » و « ئەبێت بیەلێنم نەمێشکم وون کردوەو نە بیرو هۆشم دۆڕاندوە » (٧) ، بەمەشەوە ناوەستن،بەڵکو خۆ بەختکردنەکەشی دەبێتە **مایەی چەقەنەلێدانو رابواردن** « کۆمەڵە هەرزەکارێکی نەفامو سەرلێشێواوبە دەوری قەنارەکەی مەنسووردا چەقەنە لێنەدەن »(٨) . ئەوەی پێویستە لێرەدا سەرنجی بۆ رابکێشرێ هەڵبژاردنی مەنسووری هەللاج ( وەکورەمزێك ) کە گومانی تیا نیە هەڵبژاردنێکە لە جێی خۆی، چونکە مەنسوری هەللاجو خۆ بەختکردنەکەی لەپێناو راستیو مرۆڤدا . ولە دوایشدا مردنە تراژیدیایەکەی ، باشترینو گونجاوترین رەمزە بۆ هەموو مرۆڤێکی راستگۆو کوشتیی دەستی زۆرداوانەی، ئەوانەی وتەی راست بە تاوانێکی گەورە دادەنێن لەهەموو شوێنو کاتیشدا . مرۆڤ لە بابانۆئێلدا « تاك » نیە ، بەڵکو کەسایەتیە ـ شخص هەرچەندە هەڵوێستەکەیش تاکرەوان ـ فردی دەربکەوێ ، بەڵام لەبەر ئەوەی . مرۆڤ وەکو رەمزێك بۆ مەبەستێکی گەورەتر و پیرۆزتر بەکارهێنراوە ،

بۆیەناکرێ هەلوێستەکەشی وەکو پزوتنەوەی « تاك » ێکر باخی لە قەلەم بدرێ ، بەلکو نەبی وەکو بەشێك لەچەوچۆلیەکی گشتی پیشان بدری جا ئەگەر ئاوڕێك لە ناوەرۆکی چیرۆکەکانی ـ بابانۆئێل ـ بدەینەوە، دەبینین هەر یەکە لەبەشێك لە بەشەکانی کۆمەلەوە وەرگیراون .

لە چیرۆکی یەکەمدا « تابلۆی دیمەنی خەمبارێکی ئازاردراو » مرۆڤ گیرۆدەی دەستی کۆمەلەکەیەتیو بە دەستیەوە دەنالێو وێلی ( «قیم» ورەوشتو قدسیەت )ە(٩) چونکە لەو کۆمەلەی کە (قیم ورەوشت و قدسیەت )ی تیا سەردبڕری کە هەللاچە «کۆمەلە هەرزەکارێکی نەفامو سەرلێ شواو بە دەوری قەنارەکەی مەنسووردا چەقەنەلێ ئەدەن »(١٠) .

بەمەشەوە ناوەستی بەلکو «گالتەشیان بە قولنگەکەی فەرهادو کێوی بێستون دێت »(١١) و « ژیانو کاری ئەوینی شیرینیشیان لەبن‌دار بەرویەکی پیرا»(١٢) ناشتوە. **و هەمو پێزانینێکیانیش ئەوەیە بە « شیرەی جرتێك » وەلامی بدەنەوە.**

لە چیرۆکی دووەمدا « کاتی کە خازە ئەدوێ » نموونەیەکی تری ژانەکانی مرۆڤی راستگۆمان بۆدەس نیشان ئەکا لە کۆمەلێکی بێ باکدا . کە ئەمجارەیان بە گالتەپێکردنو ئازاردانەوە ناوەستی . بەلکو بە(شێت)یشی دادەنێن . (لاوە) بۆیان دەسوتێو لە ژانەکانیانا دەژی « بە قسەو هەلوێست » نەگۆڕاوە، و دەیەوێ خەلکەکە هۆشیار بکاتەوە و یادێکی شیرینی قارەمانەتیان بهێنێتەوە بیر « لەبەر گۆڕەکەی کاك ئەحمەدی شێخیش نیە کە هەمو هەینی‌یەك بە پێ بۆ دیدەنی بەردە قارەمانی‌پیرۆز دەچم » (١٣) کەچی ئەو خەلکە بە شێتی دادەنێو ئازاری دەدەنو «قسەو قسەلۆکی» دوانەخەنو « دوور نزیك پلاوی دلتەزێنەرو تیرو توانجی جگەر بڕ وتفو قێزو بێزیان لێ‌نەکردوە»(١٤) و کە لەبازاردا دەیابینێ « یەجرتلێدان » هەلیان دەبڕیو « بەتوێکلە شوتی تەماتە شاویش »(١٥) دەکەوتنە سەر وگوێلاکی . بەلام لەگەل هەموو ئەمانە شا (لاوە) هەر هەولدەدا بیسەلمێنێ شێت نیە ، و خەلکەکەی بیناسن وەك خۆی خۆی دەناسێ « ئەبێت خەلکەکە تیم بکەن .. وەك خۆم خۆم ئەناسم . ئەبێت بیسەلمێنم ئەمێشکم‌وون کردوە ونەبیر و هوشم، دۆڕاندوە»(١٦). سەرەرای ئەمانەش هەموو . (لاوە)کۆلی نەدەداو بەردەوام بوو لەسەر رێرەوی خۆی چونکەتەنها رێیەکە بۆ گەیشتن بەراستیو کۆتایی هێنان بە ئازارەکانی خەلکی ، یا ئەوانیش پێی نەزانن،یا خۆیان لە ئاستیا گێل بکەن « لاوە ئەی ئەویست تف لە خۆیو لە خەلکەکە بکا »(١٧) و هیچ کاتێ نە « بەقسە » و نە « بەهەلوێست » یش نەگۆڕاوەو ناگۆڕێ : لە دوایدا دەلێم وەکو لاوە لێرەدا رەمزی مرۆڤێکی راستگۆو لە ئازاری خەلكو کۆمەلەکەیدا قالبوو دایکیشی یان لەراستیدا مردنی دایکیشی رەمزێکی لە خۆیو لە خەلکەکە گەورەترو مەزنترە چونکە نەبوونی ئەو دایکە « رەمزە » بۆتە هۆی ئەوەی لاوە وای لێ‌بکرێ .

لە چیرۆکی سێیەم « هەنسکی شۆخێك » دا ، دەتوانین دوو خالی سەردکی دەس‌نیشان بکەین : یەکەمیان پالەوانەکەی راستگۆو چاو نەترس و مل کەچ ناکا ، بۆیە لە لایەن مل هوڕەکانی ئاغاوە ئازار دەدرێ و تەنانەت بە (شێت)یش لە قەلەم دەدەن .

دووەمیان: خەلکە بێ بارەکەیە، کە نەکوگوێ ناوەنە ئازارەکانی . بەلکو هەولیش دەدەن سووکی‌کەنو هۆیەك بۆ ئەم ئازاردانەی بدۆزنەوە تاکو ـ بەپڕوای خۆیان دلی خویان خۆش‌کەن وویژدانیان لە ئازاری لێپرسینەوە رزگارکەن « ئەبێت هەر تاوانێکی کردبێ » « بێ‌گوناه نەهێنراوەتە ئێرە » (١٨) . و هەر چەندە (غریب)دادو بێدادیەتی بە دەست بەکرێ گیراوەکانی ئاغاوە ، و داوا لە خەلکی دەکا شتێ بکەن « دەنگێ ، قسەیەك ، هەلوێستێ » (١٩) نەکو بۆ خۆی بەلکو لەبەر خۆیان چونکە « غەریب هەر بە بالای خۆیدا نەئیەڕوانی ، و بەرزی خەلکەکەشی ئەدی »(٢٠) . کەچی ئەمان شانی بێ پەروایی هەلدەتەکێنن‌و دەس‌بە کلاوی خۆیانەوە ئەگرن بای نەیبا « کوڕە با بە ئێمە پەیوەندیمان بەمەوچی‌یە ؟ با کاری خۆمان مەیسەر کەین»(٢١) . بەلام لەبای چی (غەریب) وای لێ‌نەکرێ ؟ خەلکەکە دەلێن ژنەکەی جوانە ! تۆ بلێیت ئەمەتەنها (هۆ)بێ. یا ئەمە مەبەستی نووسینی چیرۆکەکەبێ ؟ من‌وای بۆ دەچم ژنە) کەنی غەریب رەمزێ ، تەنانەت لە خۆڕاییش نیە کە جوانە ، چونکە ئەو جوانیە بۆتە هۆی ئەو هەموو ئازارو ئەشکەنجەیەی غەریب .

لە چیرۆکی چوارەمدا ( تاوان لە ژێر سێبەری داری زڕا ) ، پالەوانەکە دەگۆڕێ ودەکرێ بە ئافرەت ـ خەرامان ـ دەنا هێلە گشتی‌یەکان هەمان شتێ ، خەرامان ئافرەتێکی هەژار وێ‌کەس‌و بێ

دەسەڵاتە ، ئازاردەدرێو دەچەوسێنرێتەوە ، دیسانەوەئەو خەڵکەش « زمان لاڵو لەگۆ کەوتۆو، گوێ کەڕو مس تێکراو ، چاو کزوکوتو کوێر »(٢٢) جگە لەمەش « دنیا بە چاو تروکاندنێ ژێرەو ژوور بوابە خەمیان نەبوو »(٢٣) لەبەر ئەوەی ئەم دنیایە پوشێکی ئەوانی تیا نیە وەکو خۆیان دەڵێن ــ هەرچەندە واش‌نیە ــ با « چی ئەبێت با ببێت » . جا بۆیە هەر چەندە خەرامان دەست بە دامێنیانەوە دەگرێو لێیان دەپارێتەوە « فریام‌کەون .. بە پاکی خۆم لەگەڵ بکەن ، تەنیا ئەمجارەو بۆ خاتری تو لفەکەم فریام کەون »(٢٤) ، کەچی ئەو خەڵکە هەر هەولی ئەوەیانە ئیشەکەی خۆیان مەیسەر بێ .. جا ئەو ئیشە « ئارەزوو شکاندن » بێ ، یاساوەرکوتان .

بەلام ئەوەی ئەم چیرۆکە لاواز دەکا دوو شتی نائاساییە

یەکەمیان : خەرامان کە « لە بێ دەستەلاتیدا بە چنگ سەرو قژی خۆی ئەڕینەوە » لە پێناو ئەو منداڵە یا کەلە ژیانیا هەر ئەو شك ئەبات بۆچی کەدەرفەتی بۆ هەڵدەکەوێو لەماڵەکە دەچێتە دەرەوە،لە جیاتی ئەوەی بڕوا بە لای مناڵەکەیەوە ، خۆی دەخاتە(زێ)وەو دەختکێ وکە ئەومرد ، مناڵەکە ــ کەرەمزی دوا رۆژە ــ بۆ بمرێ ؟

دوومیان : ئەم چیرۆکە بەتایبەتی لە سێ لاپەڕەی دوایدا بوەتە وەعز ووتار بێژییەکی‌ئە وتۆ ، کە بە بڕوای من ، لە نرخی رووداوەکەی کەم کردوەتەوە ، وتاڕادەیەکیش پلەی هونەری چیرۆکەکەی هێناوەتە خوارەوە . « بێ گوناەبوو ، کەمتەرخەمی بەرامبەر کرا »(٢٥) «بێ کەس‌بوو ، هەژاربوو » (٢٦) « ئەم دیمەنە زیندوە تفێکی بێ عارانەیە بە ناوچەوانمانەوە » (٢٧) « ئەمە ئەو پەڕی شورەییە وکەسی لێ بەش‌نیە ویێ بەش نابێ (٢٨) « هەموو تاوانبارین » (٢٩) چیرۆکی پێنجەم «بابانۆئێل توراوە» کە کۆمەڵە چیرۆکەکەی بەناوەوە نراوە . رووداوێکی زۆر ساکار ــ لە رەواڵەتدا ــ وزۆر قووڵ لە راستیدا ، کراوە بەکەرەسەی‌چیرۆکەکە . دەڵێم زۆر قووڵ ، چونکە هەرچەندە مەسەلەکە تەنها ــ بەرەواڵەت ــ بریتیە لە یادکردنەوەی جەژنی چوارساڵەی لەدایك‌بوونی شوانە « ئەو شەوە چوارەم مۆمی لەدایك‌بوونی (شوان)ەدا ئەگیرسێنرا » (٣٠) ، وشوانەش ، باوکی پێش ماوەیەکی کەم مردوە « نوێ جەژنی باوکی شوان تازەبەشین وشەپۆر یەرێ کرابو »(٣١) ، ودۆستو ناسیاریش بەهۆی دەس‌کورتی ماڵی شوانەوە لێیان تەکیونەتەوە ویتر نەکاکە حەمە « بو کەشووشەی » بۆ دێنێ‌نە دادە سازان«جێبی‌بچکۆلە»، تەنانەت بابانۆئێلیش سەر بە ماڵیانا ناکا ــ لێرەشدا ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین دیسانەوە ژانو ئازارەکانی ئەو خێزانەو هەلوێستی خەڵکەکەش بەرامبەریان هەمان رێچکەی چیرۆکەکانی پێشو دەگرێتەوە ــ بەلام بۆ ئەم خەڵکە وایان لێ‌هاتوە ، لە کۆمەڵی کوردەواریدا تا ئیستا نە بینراوەو نەبیسراوە بە جارێ خزمو کەس‌و کار سەرنەکەن بە ماڵێکا پاش مردنی خاوەنەکەی ، جا وا دیارە نە مردنەکەی باوکی شوانە ئاسایی‌یە ، نەتۆرانەکەی بابانۆئێل لە دوایدا کە دەڵێ « کانی تەقیوی توڕە بوویان هەڵ نەچوو » (٣٢) و « تەنیا روناکیەك رۆشنایی پەخش ئەکرد ، گڕی مۆمی لەدایك بوونی (شوان)ە بوو » (٣٣) ، ئەوڕایەی سەرەوە دەسەلمێنێو دەری‌دەخا کە شوانە لێرەدا رەمزە ــ منداڵیش هەر رەمزەی دوا ــ رۆژبو ــ ، هەروەها مۆمەکەش هەر چەندە نووسەر دەڵێ « لەبەر کزی شەوقەکەی بە باشی چاوچاوی نە ئەبینی »(٣٤) بەلام لەبەر ئەوەی تەنیا روناکیەکە رۆشنایی پەخشت دەکا ، دەشێ ئەویش وەکو رەمزەێ بۆ روون بینیو روناکی پاشەرۆژ بەکارهێنراێ ئەمە جگە لەوەلامەکەی دایکی شوانەکە لێی دەپرسێ بابا نۆئێل بۆ تۆراوە ؟ ئەویش دەڵێ « چراکەمان کوژاوەتەوە » ، دەری‌دەخا کە ئەم چرایە چرایەکی ئاسایی نیە ، ئەمە جگە لەوە ئیمی نووسەر کە لە ئەنجامی گفتو گۆیەك دەربارەی چیرۆك وتبوی لە رۆژنامەی ــ العراق ــ دا ، ئەم چیرۆکەی بە باشترین چیرۆکی خۆی دانابو ــ لای‌خۆی ــ (٣٥) .

بەلام ئەم چیرۆکەشدا وەکو هی پێشو نووسەر پەنای بردۆتە بەر وەعز « ئای لە بێ باوکی کەدەردێکی چەند کوشندە وگرانە » (٣٦) و « ئەو زیزانە بێ بەزەین » (٣٧) و « ئەو تۆراوانەیێ ویژدانە » (٣٨) ، چونکە چیرۆکەکە هەمو ئەمانەمان بۆ دەردەخا ئیتر پێویستی‌ی بەم روونکردنەوانە نەدەکرد .

دوا تێ‌بینم ، وا تێ‌دەگەم کاكعەبدوللا بە هەڵەدا چوە لە بەکار هێنانی بابانۆئێل رەمزێ بۆ مەبەستەکەی ، چونکە بابانۆئێل تەنها لە جەژنی سەری‌ساڵی زایینی‌دا دێتو دیاری بۆ منداڵان دێنێ ،

نەکو لە جەژنی لەدایکبوونی مندالدا . لە چیرۆکی شەشەم « پەندەکەی باپیری » کەرەستەیەکی دیکە، بەکارهێنراوە بەلام بۆ هەمان مەبەست ، هەرچەندە مەسەلەی ( ئاغاو جوتیار ) زۆر وتراوە چیرۆکی کوریدا ، بەلام تایبەتی ئەم چیرۆکە لەوەدایە ـ بەڕوای من ـ کە وەکو رەمزێك رەخسێنراوە بۆ مەبەستێکی فراوانتر لە کێشەی نێوان ئاغا وجوتیار . پالەوان لێرەدا جوتیارە، تووشی ئازار دئەشکەنجە دەبێ بەدەس بەگەوەو خەلکەکەش هەمان هەلوێستی بێیاریو بێئەمەگی . لێرەدا زەلامێکی پیر کراوە بەجەرگەی رووداوەکانی چیرۆکەکە ، ئەم مرۆڤە لە گەنجیدا ئازابوەو زۆر دەردی سەری چەشتوەو توانیویەتی « شوێن دەستو جێ پێی خۆی لە دلو دەروونی خەلکەکەی ئەو سەردەمەدا » دیاری بکاو بیچەسپێنێ هەمو جارێ بە تەنگ خەلکەکەوە بوەو فریایان کەوتوە وبەهانایانەوە چوە ، ئەی ئەوە نیە جارێکیان « منالی ناو بیشکەی زوورە ئاگر تیبەر بووەکەی رزگار » کردوە . وجارێکی تریش « لە رۆژێکی سەختی زستاندا لە شاخە زەردە کچلەکەی محکەکوڕی لە چنگ گەلەگورگ رزگار کردوە ، کەچی لەگەل ئەم هەموو خۆ بەختکردنو کۆشتەی لەپێناو خەلکی گوندەکەیا، گەلێی دەقەومێ ـ وەکو پالەوانەکانی تری ئەم کۆمەلە چیرۆکە ـ خەلکەکە هەلوێستی جیوەییو بێئەمەگی دەنوێنن . « براژنو منالە وردیلەکانی برازای بەفرمانی بەگی ناوچەکەیان لە ژوورێکی مالی کوێخای گوندەکەیان توووند » (٣٩) دەکرێن ـ لەوەش دەچێ براکەی بە «دەروی خۆیەوە» دانەنیشتوەو بە « نانو دۆی رووت قایل » نەبووە ، بۆیە دایان لێ بەسەر دێ . ئەمەیان دیوی یەکەمی کارەساتەکەیە ، دیوی دووەمی هەلوێستی خەلکی گوندەکەیە ، ونەوەی ژانی ـ باپیرە ـ ی گرانتر دەکرد ، خەلکەکەبوو کە نەکو ترسنۆکو بێ هەلوێست وەستابوون بەلکو هەولیشیان دەدا بە تە هیچو پووچەکانیان تادانەکەی ئاغا وەکو شتێکی ئاساییو سادە لەقەلەم بدەنو رکوکینەی باپیرە دامرکێتەوە « چا ، قەیچێکا ، تۆ بۆ ئەوەندە شت ورد ئەکەیتەوە ، جا بۆ کۆیخا خەلکی ئاوایەکەی خۆمان نیە ؟ خانووەکەیان هەر لە چوار چێوەی ستووری ئاوایەکەدا نییە ، جا چیی تیایە ؟ یامالی خۆتان نەبێو مالی کوێخا بێت ! » (٤٠) « تەنیا بۆ تەمێکردنە » « با براکەت بە دەردی خۆیەوە دانیشتایەو بەزەیەکی بەمالو منالی خۆیدا بهاتایەوە » (٤١) . تەنانەت هەولی برا کەشی بۆوە دەس هێنانی گوزەرانێکی باشتر بە تاوان دادەنێی « یا هەر بەسەپانیەکەی مالی بەگ قایل بوایە » « کەسێ بە نانودۆی رووت قایل نەبێت ، بە باشتر ناگات » (٤٢) .

لەگەل ئەوەشا ـ باپیرە ـ ناگۆڕێو رکو کینەی دلی بەرامبەر بەگو کوێخا دانامرکێتەوەو هەولدەدا ئەو خەلکە تێبگەیێنێ کە مەسەلەکە زۆر لەوە دژوارترو پڕ مەترسیترە کە ئەوان تێیگەیون ، یان لە راستیدا خۆیانی پێوە هەلدەخەلەتێنێ ، دەیەوێ تێیان بگەیێنێ کە هەمویان گیرودەو دیلی بەگنو ئەمەی ئەمرۆ بەسەر ئەم هاتو ئەوانی لێ سەلامەتن، سبەینێ بەسەر ئەوانیشا دێت چونکە بەگ دوژمنی هەموو جوتیارێکە خاوەن هەلوێست بێیانەبێ « کوڕە لەم بوارەدا لۆمەم مەکەمە ، ئەم ئاگرە سوورەیە ئەتەنێتەوەو هەموو لایەکمان ئەگرێتەوە ، ئەمرۆ بۆ منە سبەی کاسەکەی بە سەری ئێوەشدا قلپ ئەبێتەوە » (٤٣) . بەلام ئەو خەلکە لە گۆی گادا نوستوون ، و مادام ئاگرە سوورە لەوان دوورە دەبا دەست بکرن بەکلاوی خۆیانەوە با نەیبا ، ئاگرەش هەر لێیان نزیك دەبێتەوە ، ئەمانیش هەر خۆیانی لێ گێل دەکەن ، تا ، جارێ دەیانکاتێ و ئەوسا دەکەونە هەلپە . کە ئاوەلەکەی ـ باپیرەش . وەك ئەم لێی دەقەومێ دبراژنو برازاکانی ئەویش تووشی هەمان داو دەبن ، ئەوسا مووی لەشی رەپ دەوەستێو چاوی بەرپێی خۆی نابینێو دەیەوێ هەلکوتێتە سەر رپیاوە کولەبنەکەی بەگ ـ وفورتمی لە بنادەر بهێنێ »(٤٤) تا « تاوانەکە بەسەر خۆی نەهات هەستی بەئازاری » باپیرە نەکرد « وهۆشی بە یەردا نەهاتەوە » بۆیە لەدوایدا دەلێ « ئەوە رەحیم راستیکرد » ، بەلام لە پاش چی !!

لە چیرۆکی حەوتەم ـ تاپاك ـ رووداوێکیتر کراوە بە کەرەسەی چیرۆکەکە بە مەبەستی خستنە رووی لایەڕەیەکی تری ژیانی خەلکیو گێنگل دانیان لە ناودەریای ژانو ئازاردا . (نازە) بۆو (دلێر)ی کوڕی دەگرێو نانی جەژنی بۆ هێناوەتە سەر گۆڕەکەیو لێی دەپارێتەوە کە هاوبەشیی بکا « هاوبەشیم بکە دایکتم دایکت » . بەلام ـ دلێر ـ مردوە وگۆڕیش بێ دەنگ ، بۆیە ئەمیش بەدەم گریانو سۆزەوە دەلێ « کوڕم ، دەنگم

ناناسیتەوە ! جەژنەکەم لێ تێك مەدە، من دایکتم نانی جەژنم بۆ هێناوی » (٤٥) .

ئەم کارەساتە ئاساییە رۆژانەیەی ( سەر کۆڕستان ) بەکارهێنراوە بۆ مەبەستێك کە قوول لە دەروونی کاك عەبدوللاوا رەگی داکوتاوە و هەرچی بکا لێی رزگار نابێتو بڕواش ناکەم بیەوێ لێی رزگاربێت ، چونکە مرۆڤی راستگۆو لە ژانا قالبوو ، هەرچی بەسەربێ ئەخۆی دەدۆرێنێو نە راستگۆییەکەی « هۆشم ، بیرم ، گیانم ، خولیاو وشەیدای ئەو جۆرە قوربانیی وسووتانــدنو خۆشەویستیانەیە » (٤٦) . دەیەوێ بلێت « هەر دەردەدار هەست بە ژانو ئازاری دەردەدار ئەکات»(٤٧)، دەیەوێ بلێت ژیانی ئەم سەردەمە ئەمەندە ئالۆزو پڕ گرفتو زۆرداریە هەندێ مرۆڤی کردوە بە جانەوەر تاڕادەی مرۆڤ خواردن«بریا ناسۆر ناسۆری بخواردایە وەك چۆن مرۆڤ مرۆڤ ئەخوات » . لە دوایدا کە بەخۆیدا دێتەوەو بیرێ لە خەلکەکە دەکاتەوە ، ئاوات ئەخوازێ هەمو کەسێ وەك ئەم بن « تۆ بلێی هەمو مرۆڤێك کەمو زۆر خاونی ئەو هەستو گیانە بێت » دەلێ « بڕوا ناکەم » راستیش دەکا ، چونکە ئەگەر هەمو خەلکی خاوەنی ئەو هەستو گیانە بونایە ژیانی مرۆڤ ئاسودەو بێ گرفتو بەختیار دەبو ، تەنانەت مرۆڤە درندەو جانەوەرەکانیش وانەدەبوون مرۆڤ بەگشتی « بە جۆرێکی » دەبوو .

چیرۆکی هەشتەم ـ خونچە ـ یە ، هەرچەندە لێرەشدا بابەتێکی ساکار و زۆر قسە لە سەرکراو هەلبژێردراوەو کراوە بەکەرەسەی چیرۆکەکە کە دلدارییە ، بەلام دیسانەوە بۆ مەبەستێکی فراوانتر بەکار هێنراوە . ئەو خۆشەویستیەی لە نێوان سیروانو خونچەدا لە منالیەوە پشکوتووەو بەرەبەرە لەمەد چڵو گەلای رواندەو بوە بەدرەختێکی هەمیشە سەوزی خۆ راگر لە بەردەم کارەساتەکانی ژیاندا . ماوەیەك مالی خونچە وون دەبنو سەر لە نوێ دەگەڕێنەوە هەمان گەڕەك کە مالی سیروانی لێیە ، بەلام ئەمجارەیان بێ خونچە چونکە مردوە « هەفتەی رابوردوو لە پەڕینەوەی ئاوە ـ خوڕە ـ کەدا لافاو بردیو تا نیستاش ئەمان دۆزیوەتەوە » (٤٨) وەك دایکی خونچە دەلێ .

ئەو تالە مووە باریکەی ئەم چیرۆکە بەهەشت چیرۆکەکەی تری کۆمەلەکەوە دەبەستێ ، رەنگە تەنها لەوەدابێ کە کاك عەبدوللا خولیای رەوشتی بەرز و خوو نەریت پاراستنە بۆیە لێرەشدا دەبێ خونچە بە ئەمەگ بێ « وەفا خنجیلانەکەی ئەوسای لەگەل تەمەنیدا هەلکشاوەو بەهێزتر ، رەگو ریشەی لە دەروونیدا داکوتاوە » (٤٩) ویادکی خونچەش « دلو دەروونپاك » و براکەش « لە رەوشت بەرزیدا لە دەریای ئەزاکەتدا نوقم » بوە .

دوا چیرۆکی بابانۆئێل لە دەریای ئازاردا » دەما نگێرێتەوە سەر هەمان هێلی گشتیی چیرۆکەکان ، لەگەل بەکار هێنانی نەرتێکی کوردەواری ؛ ئەویش چوونە سەر گۆری شێخو مشایەخە، بەمەبەستی بەفریاکەوتنو بە ئامانج گەیشتن . کۆمەلێ ئافرەت ، هەندێکیان بێوەژنو دۆعاونزا بۆ ساوا کۆرپەکانیان دەکەن « هاتوم بەدەنگمەدە بێیت ، ودەست بە بالی تولفەکەمەوە بگری و بیپارێزی ٠ تا پێبگات بەلکو سالەژێر سێبەرەکەیدا بحەوێمەوە ! (٥٠) لێرەشدا ، وەك چیرۆکەکانیتر ؛ مرۆڤگیرۆدەی کەو ماری زۆردارە، بەلام ئەوەی ئەو ئازارە زیاتر دەکا بێ دەستەلاتیو بێبەروایی خەلکەکەیە « دنیا هەر وا بووە ، کەس بەکەس نییە ، لە ئاستیبێ دەستەلاتیدا پشتی راستی چەماوەتەوە » (٥١). بەلام پالەوانی ئەم چیرۆکە وەکو هەموو چیرۆکەکانی تری (بابانۆئیل) بڕیاری خۆی داوەو سەنگەری خۆی هەلبژاردوە ـ « کابرای تینو بە دەم زەردەخەو بزەیەکی دوا یمانـدوو بوونەوە بە هەلە داوان شوێنیان کەوتو خێرا گەیشتە لایانو لە تەکیاندا ملی رێگای گرت تا لە دەریای ئازارەکانیاندا بژی » (٥٢).

**زمانو تەکنیك لە بابانۆئێلدا**

لەکتیبی ـ الرؤیا الابداعیە ـدا وتارێکی تۆماس مان هەیە باسی هونەری رۆمان نووسین دەکا ، کەدێتە سەر ئەرکی نووسەر دەلێ « ئەرکی نووسەر لەوەدانیە کە چەن رووداوێکی گرنگمان بۆ بگێرێتەوە ، بەلکو ئەرکەکەی لەوەدایە کە رووداوە بچوکەکانمان بۆ وا لێ بکا سەرنجمان رابکێشێ » (٥٣) .

لە ( بابانۆئێل )دا ئەگەر بەدوای رووداوی گرنگدا بگەرێنی، هیچمان دەس ناکەوێ ، بەلام گرنگی ئەم کۆمەلە لەوەدایە کە چەند رووداوێکی بچووکی بۆ هەلبژار دوینو هەستی ئێمەی خوێندەواری پێ بزواندوە . رووداوەکان زۆر سەرنج راکیش نیە ، بەلکو دەتوانین بلێین هەندێکیان زۆریان لە سەر نووسراوە ، کەواتە سەرکەوتنی ئەم کۆمەلە چیرۆکە لە

کۆیـــدایە . بـــە بڕوای مـــن سەرکەوتنەکەی لە هەلبژاردنی ئەم رووداوە بچوکانەدایـــە و بەکـار هێنانیان بۆ مەبەستێکی‌زۆر گەورەتر، وانە بەکار هێنانیان وەکو رەمز . هەرچەندە لای ئێمە مەسەلەی رەمز گرێ‌دراوە بە تەم‌و مژەوە وەکـــو پێویستیەکو تەواوکـــەرێـــك . وسەرکەوتنی بەرهەمی ئەدەبی لەوە دایە کە کەم کەس تێ‌ی‌بگا . جا هەر بەم پێوانە لەنگە هەر بەرهەمێك بەشێوەیەکی ساوە نووسرابی‌و هەمو کەسێ لێ‌ی تێ‌بگا دەبێ پشت‌گوێ بخرێ‌و لای لێ نەکرێتەوە .

(بابانۆئێل) بە زمانێکی سادەو رەوان‌و زولاڵ نوسراوە ، چونکـــە کەرەسەکانی ئەم کۆمەلە زۆر بـــە وردی‌و لەسەرخۆو لە ئەنجـــامی نەفەس درێژییەکی زۆرەوە دانە ، دانە ، هەلبژێردراون‌و هەر بەکە بۆ مەبەستێکـی تایبەنـــی . بۆیـــە زمانەکەشـــی هەر بەم شـــێوەیە هەلبژێردراوە تاکو خەلکی بزانن چی دەلێ‌و مەبەستە گشتی‌یەکە لە ئەنجامی شتە تایبەتیە بچووکەکەوە روون ببێتـــەوە بێ ئـــەوەی پلەی هونەری خۆی بـــدۆرێنێتو بکەوێتـــە زەلکاوی زمانـــی ووتار بێژی‌و رۆژنامە نوسی‌یەوە . زمان لە (بابانوئێل)دا وەکـــو هۆیـــەك بەکارهێنراوە بۆ گەیاندنی مەبەستی نووسەر بەو خەلکەی لەم بۆیـــان دەنووسێ، بۆیە لە کاتێکا کە سادەیە، لە هەمان کاتـــدا زمانێکی هونـــەری چیرۆك نووسینـــەو کاكعەبدولـــلا توانیویەتی لەزۆربەی چیرۆکەکانـــا تابلۆی جوان جوانمان بۆ بکێشێ بۆ رازاندنـــەوەی مـــەبەستەکـــەی « بەشـــەوقەوە تەوژمی هـــەستێکی زیندووی ئارەزوویەکی تەواو لـــە دەریای بێ پایانی تاسەی دووریدا مەلەی پێ‌کـــردم‌و شریتی یـــادی رۆژانی رەشـــی رابوردومانـــی ئەهێنایەوە بەرچاو »(٥٤) « لـــەم ساتەدا زەردەپەڕ بەرگی زێرینـــی بەسەر گۆێژەوا دابـــوو » (٥٥) و «نووکی پێنووسە کۆلەکە لە سەرخۆ وبەو پەری ئارام‌و دوور لە هەلـــە شەیی‌یەوە بە ئارەزووی خـــواستی رۆژگار پەڕە لە دوای پەڕەی مێژووی رەش ئەکردەوە » (٥٦) ونەگـــەر بەدوای ئەم وێنە جوانانەدا بگەرێین زۆرمان بەرچاو دەکەوێ بەلام لەبەر ئـــەوەی وەکو کوردەلێ ـ مشـــتێ نموونەی خەرواریکە ـ بەم یەك دوو نموونەیە وازدێنم . بەلام ئەوەی لە رووی زمانەوە سەرنج ڕادەکێشێ هەندێ‌کەم‌و کوڕیە ، کە لەم خالانەی خوارەوەدا دەس نیشانیان دەکـــەم

١ ـ لە هەندێ چیرۆکدا زۆر جار چەن رستەیەك وتراوە کـــە هەمویان هەمان واتا دەبەخشن، بۆیە پێویـــستی نەدەکرد بـــەو شێوە دووبارە کردنەوەیە ـ اطناب ـ و نووسەر دەیتوانی مەبەستەکەی بـــە کورتی‌و بەرستەیەك بە خـــوێنەر بگەێنێت وەك « دەمەتەقێ‌یەکی گەرم وتوندوتیژ » ل ١٠ و « حەمە مین بەوە پەســـتی‌و مۆنـــی‌و گـــرژی دایگرت » ل ١٥ و زمان لال‌و لە گۆ کـــەوتوو گـــوێ کـــەڕومس تێکـــراو ، رچـــاو کـــزو کوتو کوێر « ل ٤٣ و » بـــۆ خۆشـــی ئەگریا بۆ خۆشێ ئەپاڕایەوە ، بـــۆ خۆشی ئەکروزایەوە » ل١٠٦

٢ ـ خـــالێ دووەم کـــە ـ بەبڕوای من ـ هەندێ لە پلەی هونەری ئـــەو زمانـــە زولالـــەی کاكعەبدوللا کەم دەکاتەوە ، پەنـــا بردنە بەر وەعزو ئامـــۆژگـــاری‌و شێوەی دروشم‌کاری بە تایبەتی لەو تەعلیقاتانـــەدا کـــە دەربـــارەی رووداوەکان دەیدا یان لە کۆتایـــی هەندێ چیرۆکدا نوســـیویەتی وەك لەم نموونانەی خوارەوەدا بۆمـــان دەردەکەوێ « ئەم دیمەنە زیندوە تفێکی بێ عارانەیە بە ناوچەوانمانەوە ئەمە ئەوپەڕی شورەییەو کەس لێ‌ی بێ بەش نی‌یەو بێ بەش نابـــێ ، هەموو تاوانبارین » ل ٥١ و « ئەو زیزبوانە بێ بەزەیین ، ئەو تۆراوانە بێ ویژدانن » ل ٦١ و « پێویستە پەندو عیبرەت لە ڕابوردووی دوورو نزیك وەرگرین » ل ٧٤ . . . هتد

٣ ـ بەکارهێنانی شـــێوەی سلێمانی لە هەنـــدێ شـــوێندا هـــەرچـــەندە زۆر کـــەس وەك بەکارهێنانی وشەی « خوارێ » لە جیاتی خوارەوە لە لاپەڕەکانی ( ١٠و ١٩ و ٢٦ و ٤٣ و ٦٥ ) . یـــان بەکارهێنانی هانین لەباتی هێنـــان ( ل ٥٦ و ٨٣ ) . هەروەها تولف لە جیاتی منداڵ . و جەحێل لە جیاتی هەندەکار یا لاو . . .

٤ ـ لە دوایدا هەندێ هەلەی رێزمانی کە دیـــانەوە زۆر کەمـــن وەك « ئەوانە کلری‌تێ‌نەنەکرد ل٢٠ » کە دەبوو بلێ کاریان تێ‌نەنەکرد. یان « دلی منداڵەکانیان ئەدانەوە ل٧٧» کە دەبێ بلێ ئەدایەوە . یـــان « هەروەك بلێ‌ی ئەو دەمە لـــە جووتکردن‌و دروێنە هاتۆتەوە ل٧٨» هاتبێتەوە راستترە ـ یان کە دەلێ « بەرگـــەی جـــەوری نەهاتـــی پێ‌بکات ل ٨٢ » دەبێ بلێ پێ‌بگرێ . ئەگەر بێینە سەر باسی تەکنیـــك دەتوانـــین بلێـــین هەرچەنـــدە چیرۆکەکان لە رەوالەتدا بە شێوەی گێرانەوە (سرد) نووسراون ، بەلام ئەوەی سەرنج رادەکێش هەلبژاردنی رووداو و پالەوانەکان . کە هەمویان بۆ مەبەستێکی تایبەتی‌و لە ئەنجامی هۆشی‌و بیرکردنەوەیەکی قوولەوە

کراون بە کەرەستەکەی ئەم چیرۆکانە واتە وەکو رەمزێك . جەبرائیبراهیمجەبرا دەڵێ « رەمز ئەوەیە کە پڕ واتابێ » (٥٧) . و لەبەر ئەوەی زۆربەی پاڵەوانەکان بێ باوك یا بێ دایك .. راستگۆو ئەگۆڕ وهەژارن ، و لەگەڵ هەمو ئەو گاڵتەپێکردنەو ئازاردانەی خەڵکی ، ئەمان هەر خۆشیان دەوێنو لە پێناویاندا دەبن بە کوشتیو تووشی جۆرەها ئازار دەبن ، کەچی هەر لەخۆشەویستیو راستگۆییو خەباتی خۆیان ناکەون، بۆیە دەتوانین بڵێین لە خۆاریی نیە ئەم بێباوکیو بێ دایکیە ، ونابێ تەنها بڕوانینە رووکەشی مەسەلەکان بەڵکو دەبێ بیانیەستینەوە بەو ئێش و ئازارەی دەیچێژن چ لەئەنجامی ئەوێ کەسیەوەبێ یا لە ئەنجامی راستگۆییو کۆڵنەدانەوەبێ .

هەروەها لەم کۆمەڵەدا تەکنیکی شانۆ یا زمانی شانۆ بەکارهێنراوە واتە دیالۆگ بۆ روونکردنەوەی مەبەستو رووداوەکان . پێش ئەوەی کۆتایی بەم لێکۆڵینەوەیە بێنم قسەیەکی خۆم دووبارە دەکەمەوە کە پێش شەش ساڵ کردومە دەربارەی هونەری چیرۆك نووسین لای کاكعەبدوللا لە کاتی هەڵسەنگاندنی دووەم بەرهەمی ( گڕی کەفەوشکەکانتان دائەمرکینمەوە . و بە بڕوای خۆم ئەم کۆمەڵە چیرۆکەی ئیستای ئەو ڕایەی ئەوسام دەسەلمێنێ ، و ئیپاتی دەکات کە زەینم بەهەڵەدا نەچوبو دەربارەی ئەم چیرۆکنووسە . ئەمەش ڕاکەمە « هەندێك هەن ئاوێنەی راستەقینەی ئیشو ئازار و هیواو ئاواتی گەلەکەیانن ، لە واقیعی ئەمڕۆی کوردەوە نوسینەکانیان هەڵئەهەنجێننو دڵسۆزانە راست ودرۆ دەرئەخەن ، و باش و خراپ ئەخەنە روو .. وهەوڵ ئەدەن ڕێبازی ئەمڕۆمان لە هەمو درکو داڵێك پاك بکەنەوەو ڕێگە خۆش بکەن بۆ نەتەوەی داهاتومان » (٥٨). رووداوەکانو پاڵەوانەکانی ( بابانۆئێل ) یش لە واقیعی کۆمەڵێ کوردەواریەوە هەڵبژێردراون بەمەبەستی دەرختنی راستو درۆو جیاکردنەوەی باشو خراپ ، وپاك کردنەوەی ئەو کۆمەڵە لە هەموو درکو داڵێكو ڕێگە تەختکردن بۆ نەوەی داهاتوو . بۆیە دووبارە دەڵێمەوە « بەگشتی ئەتوانین کاك عەبدوللا بە قوتابیەکی زیرەکی قوتابخانەی ریالیزمی رەخنەیی دابنێین » (٥٩) .

لە کۆتایی‌دا قسەکانی جۆرج ئامادۆ دوبارە دەکەمەوە کە لە سەرەتای ئەم لێکۆڵینەوەدا نوسیومە « ئەگەر نووسینەکان لەگەڵ گەلدابن لە تێکوشان خۆشو ناخۆشی‌دا ، ئەوە ئەم جۆرە نووسینانە هەرگیز لە بیر ناچنەوە پاش سەدان ساڵیش بێ » (٦٠) بۆیە من لەو بڕوایەدام کە (بابانۆئێل)یش لە بیر ناچێتەوە وەکو بەرهەمێکی راستگۆ چونکە نووسەرەکەی توانیویەتی «بەشێك بێ لە نیشتمانو کاتەکەیو راستی بڵێ دەربارەی ژیانو نەتەوەکەی » (٦١) ●

## پەراوێزەکان


(١) الرؤیا الابداعیە ـ مجموعە مقالات ـ اشرف علی جمعها سکل بلوك وهیرمان سالنجر ترجمە اسعد حلیم‌مراجعە دکتور محمد مندور ل ٢٣٧ لە وتارێکی سارتەرەوە
(٢) هەمان سەرچاوە ل ٢٥٢
(٣) رۆژنامەی (العراق) ژمارە ٧٥٢ لە ١٤ــ٨ــ١٩٧٨
(٤) مجلە الاقلام ژمارە ٤ ساڵ ١٤ کانونی دووەمی ١٩٧٩ ل ١٧٠
(٥) العراق هەمان سەرچاوە
(٦) بابانۆئێل ل ١٠٩
(٧) بابانۆئێل ل ٢٣
(٨) بابانۆئێل ل ١٤
(٩) بابانۆئێل ل ١٠
(١٠) بابانۆئێل ل ١٤
(١١) بابانۆئێل ل ١٥
(١٢) بابانۆئێل ل ١٥
(١٣) بابانۆئێل ل ٢٣
(١٤) بابانۆئێل ل ٢٠
(١٥) بابانۆئێل ل ٢٠
(١٦) بابانۆئێل ل ٢٣
(١٧) بابانۆئێل ل ٢٤
(١٨) بابانۆئێل ل ٣٦
(١٩) بابانۆئێل ل ٣٧
(٢٠) بابانۆئێل ل ٣٨
(٢١) بابانۆئێل ل ٣٧
(٢٢) بابانۆئێل ل ٤٣
(٢٣) بابانۆئێل ل ٤٤
(٢٤) بابانۆئێل ل ٤٤
(٢٥) بابانۆئێل ل ٥٠
(٢٦) بابانۆئێل ل ٥٠
(٢٧) بابانۆئێل ل ٥١
(٢٨) بابانۆئێل ل ٥١
(٢٩) بابانۆئێل ل ٥١
(٣٠) بابانۆئێل ل ٥٥
(٣١) بابانۆئێل ل ٥٦
(٣٢) بابانۆئێل ل ٥٦
(٣٣) بابانۆئێل ل ٥٦
(٣٤) بابانۆئێل ل ٥٦
(٣٥) العراق هەمان سەرچاوە
(٣٦) بابانۆئێل ل ٦٠
(٣٧) بابانۆئێل ل ٦١
(٣٨) بابانۆئێل ل ٦١
(٣٩) بابانۆئێل ل ٦٩
(٤٠) بابانۆئێل ل ٧٠
(٤١) بابانۆئێل ل ٧٠

(٤٢) بابانۆئێل ل ٧٠
(٤٣) بابانۆئێل ل ٧١
(٤٤) بابانۆئێل ل ٧٣
(٤٥) بابانۆئێل ل ٨٥
(٤٦) بابانۆئێل ل ٨٣
(٤٧) بابانۆئیل ل ٨٢
(٤٨) بابانۆئێل ل ٩٦
(٤٩) بابانۆئێل ل ٩٥
(٥٠) بابانۆئێل ل ١٠٥
(٥١) بابانۆئێل ل ١٠٢
(٥٢) بابانۆئێل ل ١٠٩
(٥٣) الرؤيا الابداعيه ل ١٢٣
(٥٤) بابانۆئێل ل ٩
(٥٥) بابانۆئێل ل ٢٣
(٥٦) بابانۆئێل ل ٤٣
(٥٧) جبرا ابراهيم جبرا ـ الرحله الثامنه ـ ل ٦٤
(٥٨) بروانە رۆژنامەی ژین ژمـارە ١١٦ ی ٢١ـ٦ـ٧٣ و ١١٧ ی ٥ـ٧ـ٧٣
(٥٩) ژین هەمان سەرچاوە
(٦٠) الاقلام هەمان سەرچاوە
(٦١) الاقلام هەمان سەرچاوە

• عبد الكريم پەرەنگ •

# خەونێکی تر لە ڕەشماڵەکەی زەری دا

کەپنەکی شوانیم لەبەرە ..
بەرخی بابی بێ ئەمەگت .. لەبەرێزو بژوێنـــەوا دەچەلێنم ..
لەبەر ڕووی تۆ بە بێخاووس ..
بە سکێ تێرو بە دووان برسی ..
زەریێ خانم .. لەبەر ئەوەی .
بە قسەی عەشقی کەژی‌ی دلت بەدوێنی ..
ـــ بەلام نایە چەندە بانگی گوڵەزەری چاو قەرنسیلی باریکەلە وەکەم نایە ..
خۆی لەمن کردە کەوێکی گەردن ڕەشو
خۆی لە چیاکانی کوێستانا لێوون کردم ..
دەترسم لە بیرەبکاو لە گەرمەسێری گەرمێن
غەریبی‌دا بەجێم بێلێ ..
نایە ئەمرۆ ، وادوو ڕۆژە دەنگی ڕازەکیەکانی
گوڵەزەریم لە گوێ نایە

★ ★ ★

گەر شوان گەر گاوانبم
بێکاری خاتوون گولەزەریم هەر پێخۆشە
باهەربلێن ..
پیاوی شوانە ویلەو بێکەس
لەگەڵ ئێلی چی پێناکرێ ..
ناتوانێتیش عەشقی گەرمی بەکر شێخان
کەوی بکاو
تەنیا جارێ گولەزەری خۆشەویستی بەوێنێ ..
بەڵام ئەگەر تەنیا جارێ ..
گولەزەر ناوی ئەوپناوی خۆیم باتێ ..
کۆرپەی گیانی هیوای ویلی لەشی نامۆم
هەرگیز نامرێ ..

★ ★ ★

ـــ زەرێ خانم ..
تەماشاکە ئەستێرەکان ..
سەری کاسی عەشقەو ئاوارەیی خۆیان
ناوەتە کۆشی تاسەو حەزی دلی ئاسمان
ئاسمانی شین وەستی خۆزگەی دڵنەوایی
بەسەری کاسیاندا دەهێنێ ..
دەتۆش جارێ کۆرپەی وورکی اخەونەکانم
بلاوێنە ..
با چەکەرەی چرۆی حەزی تۆ پەرسێم نەبرووکێ ..
دەکەوی بەو .. لەچیمەنی دلداریمدا پاخی مەبە ..
لە ترۆیکی چیایەکی دەربەدەری ئەم کوێستانە
رەشماڵێکت بۆ هەڵدەمەو
خۆشەویستی ئاوارەتی تیا دێراوکەم ..

★ ★ ★

کلۆ بەفرە زابدارەکان لە باوەشی کەژا نەبێ ..
ناتوێنەوەو .. گەرووی ووشکی دلداریکیش ،
تەرناکەنو ناچۆڕینە ..
کاسەی عەشقی خاکێکەوە ..
باوەشی بۆ مانگ نەکاتەوەو
هەورەکان لە ئامێز نەگرێ
ـــ زەرێ خانم ..
تۆش وەرە گۆرانیم بۆ بلێو
لە ئاگردانی ساتەکانما
سووتوی خەونە کۆنەکانم داگیرسێنەو
لەگەڵ ژانی تەزیوەدا
قاڵ بەرەوەو
بە قامکی دەستی لەکۆچووت

لە دەرگا بــــێدەروازەکـــەی ڕووباری عەشـــقی
دەروونمدە ..
سەری کاسم لە باوەشی حەزەکانتا بسووتێنەو
ئەشکەوتی عەشقی ئاسکی سەرما بردووتی پێگەرم
بکەرەوە ..

★ ★ ★

کە فوویی کێلگەی سینەت دەکێلێتو
بە دووی ژانی گولە گەنمی گۆرانییەکا دەگەڕێ
تابورکانی بوومە لەرزەی جیهانێکی
لێ هەڵێنجێو
بە ڕووی عەشقە دەستکردەکەی
بەکر شێخان بیتەقێنی ..

★ ★ ★

ـــ زەرێ خانم .. لە بیرتەوێ ..
لەژێر دارتەلی پانگە شەوی ژووانێکا یەکەم نامەی
ڕازەکانم بۆ کردیتەوە ..
خۆشەویستیو دلداریتی تیا نامۆ بوو ..
لە بیرتەوێ .. لەفەرهەنگی شوانکاریدا بە ئەستێرەی
ماچەکانم
ناووم نووسیت .. !!

★ ★ ★

سەرم دەکرد بە ژێر بەفری چیاکاندا
بە دووای گونی پرووکاوی
ژێر هەرەسێکا دەگەڕام ..
خۆشەویستی ئاوارەتی پێکەوی کەم ..
لە قولایی ووشەی ڕازەکیەکانتا
بە دوای خۆمدا دەگەڕامو
سۆزی عەشقی دالو بابم
لە پشکۆی خەونەسوێ دارەکانتدا تواندموە ..
کە گوێت لەدەنگی یەکێبوو
بە گوێی دلی دەربەدەری ئەم خاکەدا ،
دەچرپێنێ ..
ئەوە (( فەر )) ەو دەنگی ڕازی ئەستێرەکان
بۆ ماسییە ئاوارەکان .. دەدرکێنێ ..
ئەوە منەو خۆشەویستیت فێری کرد ووم ..
دلم بۆ هەوری تۆراوی سەر چیاکان
بکەمەوەو
هێلانەیەك بۆ ئەو مەلانە دروست کەم ..
لە ئێوارەیەکدا وونبوونو
گورانی بۆ زەردە پەری بەهار دەلێن ..

# تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسی کوردیدا

**• عمر معروف بەرزنجی •**

چەند مانگێك لەمەوبەر کۆڕی زانیاری کورد بەرهەمێکی ناوازەی زانای مێژوویوس دوکتۆر « کەمال مەزهەر ئەحمەد »ی بلاوکردەوە بە ناونیشانی « تێگەیشتنی ڕاستی وشوێنی لە رۆژنامە نووسی کوردیدا »(۱) کە بریتی‌یە لە دەرخستنی دەسەلاتی رۆژنامە لە سەرجەم کۆمەلگای مرۆڤایەتی‌داو روون کردنەوەو پێشچاوخستنی رستێك زانیاری دانسقە وناوالاکردنەوەی لاپەڕەی چەند رۆژنامە وگۆڤارێکی دێرینی وەك (ژین)ی ئەستەموول وکوردستان‌و هاوار وپێشکەوتن ، ئینجا لێکۆلینەوەیەکی مەودافراوانی زانستی‌یانە دەربارەی تێکرا ژمارەکانی ( تێگەیشتنی راستی ) کە سالی ۱۹۱۸ بلاوکراونەتەوە . دیارە ئەم کارەیش لە مێژووی چاپەمەنی کوردی‌دا جێگایەکی شیاوو سەنگین ئەگرێت و بە چەشنی سەرچاوەیەکی بێ‌خەوش وباوەڕ پێکراو دێتە پێش‌چاو ، جا لە بەر گرنگی بەرهەمەکەو کۆبوونەوەی چەند سەرنجێکی پێویست لە سەرجەم لێکۆلینەوەکەی دوکتۆر وئەو دوو لیستەی کە بۆ رۆژنامەو گۆڤارەکانی ئامادا کردووە .. بە کارێکی لە بارمزانی کە چەند خالێك نجەمە بەردەم دوکتۆرو خوێندەوارانی ئازیز

۱ ـ نووسەر لە دۆزینەوە وگەڕان‌و پشکنین‌و هەلسەنگاندنی ژمارەکانی ( تێگەیشتنی راستی ) دا

کۆششێکی سەرومرو دلسۆزانەی نوندوەو توانیویەتی کە بە وردی دەستنیشانی کرۆکی ئەو بابەتانە بکات کە لەسەر لاپەڕەکانی پەخش بوونەو تیشکێکی مێژوویی‌و ئەدەبی‌یان بخاتە سەرو تەنانەت چەند پەرە گرافێکیشیان لێ وەربگرێت و بە چەشنی نموونەیەکی باوەڕپێکراوی هەڵبژاردە بیخاتە بەردەم خوێندەواران ، نەك هەر ئەمەیش بەڵكو وەك لێکۆڵەرەوەیەکی کارزانی ئەدەبی بەراوردێکی گونجاوی کردووە لە نێوان تێکستی شیعرەکانی تێگەیشتنی ڕاستی‌و دیوانە چاپکراوەکانی شاعیرانە ، ئەمەیش سوودێکی تەواوی هەیە بۆ ساغکردنەوەی تێکست وبۆنەی راستەقینەی شیعرەکان ، بۆ نموونە تا ئێستا کۆنترین سەرچاوەکە بۆنەی وتنی پارچە شیعرەکەی نالی ( ئەم تاقمە مومتازە کەوا خاصەیی شاهن ) ی دەستنیشان کردبێ کتێبی ( ئەنجومەنی ئەدیباتی کورد )(٢)ی ( ئەمین فەیزی )یەکە چی وەك دوکتۆر لە ( ل ١٦٧ )ی کتێبەکەی‌دا دەری خستووە کە لە ژمارە (١٨)ی ڕۆژی (٢)ی مارتی (١٩١٨)ی ئەو ڕۆژنامەیە داوتراوە کە (نالی مەنحی عەسکەری خاصەی ئومەرای بابان ئەکا ) دیارە ئەمەیش زیاتر بنجی ئەو بۆنەیە ئەچەسپێنێ ودووریش نی‌یە کە ( ئەمین فەیزی ) هەر لەو ڕۆژنامەیەی وەرگرتبێ . بەڵام دوکتۆر لەگەڵ ئەو هەموو رەنجەیدا کە بەناوچەوانی کارەکەیەوە دیارە گەر بهاتایەو لە پاشکۆی لێکۆڵینەوەکەی دا تێکڕا ژمارەکانی ئەو ڕۆژنامە دەوڵەمەندەی بگرتایەتەوەو هەروا بە شاراوەیی نەی هێشتابەوە ئەوسا پڕ بە پڕی وشەی ڕاستی ( تێگەیشتنی ڕاستی ) دەر ئەچوو . چونکە ئەم لێکۆڵینەوەیەنەی توانیوە کە پەل بهاوێژێت بۆ سەرجەم بابەتەکانی ئەو (٦٧)ژمارەیەو بۆ هەربابەتەی چەند پەرەگرافێکی پێویست وەرگیراوە وخوێندەوارانیش گەرەگیانە کە هەموو ئەو بابەتانەیان لەبەر دەستدابێ و دوای سوود لێ وەرگرتن بە پێوانەو سەنگی تێگەیشتنی تایبەتی خۆیان جۆری بۆچوونیان دەربڕن ، ئەو بیروڕایانەیش کە لە لێکۆڵینەوەکەدا هاتوون وهەر چەندە مەوزوعی یانەو گەنجینەیەکی پڕ لە زانیارین باری سەرنجی دکتۆرن و رەنگە ڕۆشنبیرانیش بۆ چوونی خۆیان هەبێ ، لە لایەکی ترەوە خوێندەواران مەبەستیانە کە زیاتر لە شێوەو ڕێنووسی ئەو ڕۆژنامەیە بگەن و تەنانەت کلێشەی بەرگەکەی ببینن بەڵام ئەمانەیان دەستگیرنابێ وچاویان لەرێیە .. خۆگەر نووسەر بە چەشنی ڕۆژنامەکانی ( بانگی کوردستان و ڕۆژی کوردستان )(٣) هەموو ژمارەکانی بگرتایەوە ئەوە بێگومان نرخ و بەهایەکی زیاتری ئەبوو بۆ ئەدەب‌و زمان و مێژووی کورد ، کە ئەمەیش کارێکی هێند گران نی‌یەو ئومێدەوارین دوکتۆر ئەم کارە بخاتە سەر پرۆژە پیرۆزەکانی تری .

٢ ـ نووسەر لە لێکۆڵینەوەکەی دا بە گەلێ بەڵگەو وردکردنەوەوە بەو ڕایە گەیشتووە کە ( مێجەرسۆن ) و ( شوکری فەزلی ) لە بەڕێوەبەرانی سەرەکی ئەو ڕۆژنامەیەبوون ، تەنانەت لە (ل ١٠٩)دا ئەوەیش باس ئەکا دیوانی شوکری فەزلی لە لای خوا لێخۆشبوو ( مامۆستا نەجمەدین مەلا )ووە کە ئەمەیش ڕاستەو خاوەنی ئەم باسە دەستنووسێکی شیعرەکانی شاعیری لە لای ناوبراو بینیوەو لە پێشەکی‌یەکەیدا کە نەجمەدین مەلا بۆ شیعرەکانی نووسیبوو ئەو ڕاستی‌یەی وتووە کە شاعیر لە دەرکردنی ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی دا بەصداربووە کە دیارە ئەمەیش زیاتر بۆچوونەکانی نووسەر پتەوتر ئەکا(٤) ..

٣ ـ لە کتێبەکەدا چەند پارچە نووسینێکی مێجەرسۆن بە نموونە هێنراونەتەوە کە لە ( پێشکەوتن ) و ( تێگەیشتنی ڕاستی ) دا نووسراون، بەتەنها سەیرکردنێکیش ڕادەی کوردی زانینی (سۆن) دەر ئەخەن‌و و بە شێوەیەکی ڕەوان داڕێژراون ، ( سۆن ) کە لە ڕەچەڵەکدا ئینگلیز بووەو بۆ سوودومەبەر بوونی مەرامی کاری ئەوان هەڵسووڕاوەکە چی لە سەرجەم نووسینەکانی دا بەلای بەکارهێنانی وشەیەکی ئینگلیزی دا گوزەری نەکردووە ، کەچی هەندێ لە نووسەرانی ئەمڕۆ بەبێ کاری پێویست و تەنانەت وشەی ئازیزی کوردی لە ئارادایەو بە چەشنی مۆدیلی عەسر وشەیەکی ئینگلیزی لە پەناو پاساردا دەستە مو ئەکەن و لەباتی وشە کوردی‌یە ڕاستەقینەکان بەکاری ئەهێنن کە ئەمەیش تا بڵێی گرتنی ڕێرەوێکی ناشایستە وزیان بەخشە (٥) .

٤ ـ دوکتۆر لە دوو پاشکۆیەی ناو کتێبەکەی دا بۆڕۆژنامەو گۆڤارەکانی تەرخان کردووە لە بایەخی بیبلیۆگرافیا دواوە و لە (ل٢١٦)دا دانانی بیبلیۆگرافیایەکی دروستی ڕۆژنامە نووسی کوردی بە کارێکی زانستی پێویست داناوە وئینجا بەبێ ی

توانست پەلی بۆ ئەو رۆژنامەو گۆڤارانە هاویشتووە کە تا ئێستا دەرچوون (٦) ... دیارە ئەمەیش رەنجێکی دلسۆزانەی تری نووسەرە بەلام لەگەل ئەمەیشدا بەو رایە گەیشتووم کە هێشتا نەتوانراوە گەلێ لایەنی رۆژنامەی کوردی تەپ و تۆزی شاراوەیی لێ بتەکێنرێ و ئەو لیستانەی کە لەلایەن برایان ( جەمال خەزنەدارو جەبار جەباری و دوکتۆر کەمال ) ەوە ئامادە کراون هێشتا پێویستییان بە پیا چوونەوەو گەرانی تر هەیە ، لایەنە نا دیارەکانی تری رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان بکەونە روو ، چونکە ئەم لیستانە هەر کامێکیان بگرین لە خالی چالەو وردەکاریو هەلە بیبەش نین ، بۆیە ئەو سەرنجانەی دەربارەی لیستەکانی دوکتۆرەوە لەلام گردبوونەتەوە ئەیان خەمەروو .

٥ ــ دوکتۆر لە ( ل ٨٥ ) دا وبۆ پەراوێزی ژمارە (١٠٧)وای بۆچووە کە گۆڤاری زاری کرمانجی لە حوزەیرانی سالی ١٩٢٦دا بلاوکراوەتەوە کەچی لە ( ل٢٣٤ ) داوای نیشانداوەکە لە (٢٥)ی مایسی ١٩٢٦دا دەرچووە ، دیارە ئەمەی دوایی یان راستە .

٦ ــ لە (١٦٠)دا بۆ پارچە شیعری ( دیدە چوون لێزمەی بارانی بەهار ) کە لەکاتی خۆیدا لە گۆڤاری هاواری سالی ١٩٣٢ دا بلاوکراوەتەوە بە بەرهەمی سەربازێکی نەناسراوی داناوە بەلام لە راستیدا ناونیشانەکەی (یادگار وهیوا) یە و دوای بلاوکردنەوەی لە هاوار دا بۆ جاری دووەم بە هەندێ دەستکارییەوە لە گۆڤاری ( یادگاری لاوان ) ی سالی ١٩٣٣دا بلاوکراوەتەوە و لە شیعرەکانی ( هێ . ل . ب ) ی شاعیرە

٧ ــ لە ( ل ٥٨ ــ ٥٩ ) دا لە بارەی یەکەم رۆژنامەی کوردی یەوە ( کوردستان ) چەند سەرنج پیلچوونەوەیەکی ورد خراونەتەروو ، بەلام دوکتۆر خالێکی گرنگی لە یادکردووە کە ئەبوایە پەنجەی بۆ رابکێشرایە کە بۆیەکەم جار ژمارەی یەکەمی ئەم رۆژنامەیە لە لایەن‌دوکتۆر مارف خەزنەدارەوە دۆزراوەتەوە دبە بۆنەی جەژنی حەفتا سالەی رۆژنامەی کوردییەوە هەوالەکەی لە رۆژنامەی (التآخی) ژمارە (٣٦٥)ی رۆژژ (١٩)ی نیسانی ١٩٦٨دا بلاوکردەوە بەناو نیشانی ( یوم الصحافه الکردیه الذکری السبعون لصدور العدد الاول من الجریدة الکردیة الاول کردستان من القاهرة ) دوا بەدوای ئەمەیش هەمان هەوالی بە زمانی کوردی لە رۆژنامەی (برایی) ژمارە (٣٦٧)ی رۆژی (٢٢)ی نیسانی ١٩٦٨دا خستە بەرچاوو ئەو رۆژەیشی بە جەژنی رۆژنامەگەری کوردیداناوە ، جا کە ئەمەیش ئەلێم لەوە ئاگادارم کە دوکتۆر کەمال لە ژمارە (٤)ی گۆڤاری ( نەتەوەکانی ئاسیاو ئەفەریقا ) دا باسێکی دەربارەی هەمان ژمارە بلاوکردووەتەوە بەلام وتارکەی دوکتۆر لە مانگی تەمووزو ئابی ئەو سالەدا بلاوکراوەتەوە (٧) .

٨ ــ دوکتۆر لە پەراوێزی ژمارە (١٠٦)ی (ل٨٥)دا بۆ بانگی کوردستان هەلەیەکی ( جەمال خەزنەدار ) ی‌راستکردووەتەوە کە گوایا لە ( ل٢٧ )ی رابەرەکەی داوای نیشانداوە کە ئەم رۆژنامەمەیە مانگ ونیوێك ژیاوە کە دیارە بۆچوونەکەی دوکتۆر راستە ، بەلام ئەبوایە ئەوەیش بوترایە کەپێش هەموو کەسێك جەمال خەزنەدار خۆی ئەم هەلەیەی راستکردووەتەوە و سالی ١٩٧٤ لە کاتێکدا هەموو ژمارەکانی چاپکردەوە و لە (ل١٦)دا زانیاری پراو پری دەربارەی سەرجەم ژمارەکانەوە ئاشکرا کردووە ، لە لایەکی ترەوە هەر لە هەمان پەراوێزۆ لاپەرەدا وتویەتی (کە هەندێ سەرچاوە باسی سێ ژمارەی تری بانگی کوردستانیان کردووە کە سالی ١٩٢٥ لە بەغداد چاپکراوەو ئەو سەرچاوەیەش مەبەستی سەجادییە ) کەچی دوکتۆر ئەم بۆچوونە ناراستەی بەهەلە دانەناوە کە راستییەکەی لە ١٩٢٦ دا چاپکراونو بەهۆی کارە پیرۆزەکەی جەمال خەزنەدارەوە لە بەردەستدان

٩ ــ لە پەراوێزی ژمارە (١٠)ی لاپەرە (١٥٢)دا وتراوە کە کتێبی ( ئەوەلەمین ) قیرائەتی کوردی ) سۆن دانیاوە کە لەراستیدا لە دانانی ( محەمەد زەکی ومیرزا محەمەد باشقەیە ) و سۆن پیاچووەتەوەو فرمانی ئەو بەسەر قوتابخانەکاندا بلاوکراوەتەوە

١٠ ــ دوکتۆر لە ( ل ١٠٦ )دا بۆئەو گرەوەی کە مێجەرسۆن لە ژمارە ٢٧ ، ٢٨ ی‌رۆژنامەی پێشکەوتنی سالی ١٩٢٠ دا سازی کردوای نیشانداوە گوایا پەخشانەکەی زەکی صائب بەبێ ناونیشان بلاوکراوەتەوە ، بەلام بە تەنها چاو پیاخشاندنێك بە ژمارە (٣٠)ی رۆژی (١٨)ی نوفمبەری ١٩٢٠ای پێشکەوتن دا بە وراستییە ئەگەین کە لە ( ل ٣ )دا ناونیشانی ( بۆچرووك )ی‌بە پیتی رەش بۆ دانراوەو خراوەتە دوو کەوانەوە ئەم راستییەشم لەو کتێبەدا باس کردووە کە کۆری زانیاری بەناو نیشانی ( لێکۆلینەوەو بیبلیوگرافیای چیرۆکی کوردی )(٨) بلاوی‌کردەوە .

١١ ـ له (ل ٩٥ ، ٢٣٤)ی کتێبەکەی نووسەردا بۆ گۆڤاری پەیژە وتراوە کە ( بریتی‌یە لە ژمارەیەك وتارو شیعرو لەوە دەچێ هەمووی مستەفا شەوقی خۆی نووسیبێتی ) دیارە هەڵدانەوەی سەرجەم (٤٤) لاپەڕەکەی ئەو گۆڤارە ئەم رایە ئەداتە دواوە چونکە لەو ژمارە تاقانەیەدا پارچە شیعری ( ئەی کوردی ستە مدیدەی ) مەلا هەسەنی قازی تیایە کە ناسراوە بە شاهۆ ، جگە لەمەیش پارچە شیعرێکی ئەسیری بڵاوکراوەتەوە . .

١٢ ـ لە ( ل ٢٤٢ )دا دوکتۆر لە بارەی ( شەفەق )ەوەئەو زانیاری‌یەی بەدەستەوە داوە کە سەرەتا لە کەرکووك وپاش شۆرشی چواردەی تەمووز بە ماوەیەك گوێزرایەوە بۆ سلێمانی‌و بە ناوی «بەیان»ەوە بڵاوکراوەتەوەو دووبارە براوەتەوە بۆ کەرکووك‌و کراوەتەوە بەشەفەق . بەڵام ئەوی راستی بێ ئەو برایانەی کە تا ئێستا بیبلۆگرافیایان بۆ رۆژنامە وگۆڤارەکان ئامادە کردووەو بەدوای زانیاری دا گەڕاون ئەو راستی‌یەیان نە خستووەتە بەرچاو کە ئەم گۆڤارە پاش وەستاندنی بۆ ماوەیەکی زۆر بۆ جاری دووەم‌یان راستتر ساڵی ١٩٦١ برایەوە بۆ سلێمانی لە کاتیکدا کە خاوەنەکەی عەقیدی خوا لێ خۆشبوو ( عەبلو لقادر بەرزنجی ) بەماڵەوە هاتە سلێمانی‌و (٣) ژمارەی‌تری لێ‌دەرچوو کە ژمارە (٤)ی ساڵی (٤)دوا ژمارەیەتی‌و لە رۆژی (١٥)ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٦١ دا بڵاوکرایەوە ، ئەوەی پێویستیشە لێرەدا بوتری کە ئەمجارەیان چیرۆك نووس ( محرم محمد ئەمین ) بوو بەسەرنوو سەری‌و لە.چابخانەی ژین چاپ ئەکراو خوالێ خۆشبوو ( غەفور رشید دار اغا ) کارگێری بوو .

١٣ ـ دوکتۆر لە ( ل ٢٤٣ ) دابۆ ( نەورۆز ) وتویەتی کەسێ مانگ لەسەر یەك دەرچوو ئیتر وەستا . بەڵام ئەم گۆڤارە دوای ژمارە (٣).ووبە رۆژنامەو تا ژمارە (٥)کە رێکەوتی رۆژی پێنجشەممە ٢.تەمووزی ١٩٥٩ ئەکا بە ناوی (مەشخەلی نەورۆز)ەوەبڵاوکراوەتەوە ، پاشان لە ژمارە (٦)یەوە کە رێکەوتی (٦)ی‌ئابی ١٩٥٩ ئەکا بوویە ( پاشکۆی نەورۆز . لە ژمارە (٧)یشەوە کە ئەکاتە (١٣)ی‌ئابی ١٩٥٩ لە دوا لاپەڕەیدا پاشکۆیەکی عەرەبی .ۆ دانراوە بەناونیشانی ( ملحق نوروز ) بەڵام لە ژمارە (١٠) بەدواوە ئەو پاشکۆ عەرەبی‌یەی لەگەڵدا نەما . لە ژمارە (١٢)یشەوە کە ئەکاتە رۆژی شەممە (٣)ی تشرینی یەکەمی ١٩٥٩ جارێکی تر بووەوە بە مەشخەڵێ نەورۆز . ژمارە (١٣)ی کە ئەکاتە شەممە (١٤)ی تشرینی دووەمی ١٩٥٩ هەر بە عەرەبی دەرچووەو چوار لاپەڕەیە ، لە ژمارە (١٥)بەدواوە بە ناوی ( مەشخەڵی نەورۆز )ە وەبڵاوکرایە وەکە ئەکاتە (١٣)ی‌شوباتی ساڵی ١٩٦٠ مانای وایە لە (١٤)ی تشرینی دووەمی ١٩٥٩ تا (١٣)ی‌شوباتی ١٩٦٠ وەستاوە ئینجا دەستی کردووەتەوە بە دەرچوون . ژمارە (١٧)ی ئەم رۆژنامەیە لە رێکەوتی (١٦)ی مارتی ١٩٦٠دا ولە چاپخانەی کامەران دا چابکراوە بەڵام ژمارە (١٨)ی کە لە چاپخانەی ژین چاپکراوە هیچ مێژوویەکی بە سەرەوە نی‌یە .

١٤ ـ لە ( ل ٢٤٤ )دا بۆ هیوای کوردستان وانیشاندراوە کە لە شیوەی رۆژنامەدا چاپکراوە بەڵام لە راستیدا یەکەم ژمارە لە شێوەی گۆڤاردا دەرچوو وە(٧٠)لاپەڕەیە و لە چاپخانەی کامەران چاپ کراوەوکاتی دەرچو نیشی وەك دوکتۆر نووسیوێتی تشرینی دووەمی (١٩٥٩)یە بەڵام لە ژمارە (٢)بەدواوە بووە بە رۆژنامە و زووربەی ژمارەکانی لە چاپخانەی ژین چاپ ئەکراو کاتی دەرچوو نیشی رێك وپێك نەبوو ، هەروەها دوکتۆر ئەوەیشی وتووە کە (١٢) ژمارەی لێ دەرچووە بەڵام راستی‌یەکەی (١٣) ژمارەیەو ئەمەیش رێکەوتی رۆژی چوارشەممە ١٩ـ١٠ـ١٩٦٠ئەکات .

١٥ ـ نووسەری بەڕێز لە ( ل ٢٤٩ )دابۆ ( گرنگ وتویەتی کە ساڵی ١٩٦٧ بڵاوکراوەتەوەو دیارە هەر ئەو ژمارەیەی لێ دەرچووە ، بەڵام ئەم گۆڤارە کە قوتابخانەی ( مەناری کوڕان ) دەریان کردو دوایی .وو بە قوتابخانەی مەولانا خالید بۆ ساڵی‌دوایی واتا ١٩٦٨ ناوی گۆڤارەکەیان لە (گزنگ) ەوەگۆڕی بە چیا و ژمارە دوومی بە ناوی ( چیا )وە دەرچوو لە کاتێکدا کە مامۆستا شێخ کەریم باراوی بەڕیوەبەری قوتابخانەکەو سەرنووسەری گۆڤارەکە .وو . نابێ ئەوەیش لە یادبکەین کە قوتابخانەی سانەوی ئێواران لە سلێمانی ساڵی ١٩٥٩ گۆڤارێکیان بە ناوی (گزنگ)ەوە بڵاوکراوەتەوە و تەنها ژمارەیەکی لێ دەرچوو ، ئەوەی شایانی باسە ( جەبار جەباری ) لە کتێبەکەی‌دا ( تاریخ الصحافه الکردیة فی العراق )(٩) لەم گۆڤاری گرنگ‌و چیایە دواوەو تەنانەت هەستیشی بەو گۆڕانە کردووە کە بەسەر گرنگ‌دا هاتووە .

١٦ ـ دوکتۆر لە ( ل ٢٤١ )دا بۆ گۆڤاری (پەیام) وتویەتی کە (دوا ژمارەی من دیومە لە رۆژی

١٢ی نیسانی ١٩٥٤دا دەرچووە) لە کاتێکدا کە بە ژمارەکانی ئەم گۆڤارەدا چوومەوە ئەو مێژووەی دوکتۆر دیاری کردووە بەر ژمارە (٢٣٧)ئەکەوێ بەڵام منیش لەلای خۆمەوە ژمارە (٢٦٩)م لە بەردەستایە کە ڕۆژی ٢٨ی تەمووزی ١٩٥٧ دەرچووە واتا (١٣٢) ژمارە دوای ئەم ژمارەی دوکتۆر بینیەتی لە ئارادایە.

١٧ ـ لە ( ل ٢٤٢ )ی کتێبەکەدا بۆ (پێشکەوتن) وتراوە کە لە ژمارە (٦٥) بە دواوە بووەبە ڕۆژنامە ، دیارە ئەم بۆچوونە ڕاست نی‌یە ، بەڵام ئەم گۆڤارە تەنها (١٩) ژمارەی بەچەشنی گۆڤارێکی هەفتانە دەرچووە و لە ژمارە (٢٠)بەدواوە کە ڕێکەوتی ڕۆژی شەممە (٩)ی ئابی ١٩٥٨ ئەکات بووە بە ڕۆژنامە و(٤)لاپەڕەی بە کوردی‌و (١٢) لاپەڕەی بە عەرەبی دەرچووە ، پێشتریش لە کاتێکدا کە هەڵەکانی نووسینێکی ناتەواوی ( ئەکرەم قەرەداخی )م‌ڕاست کردەوە پەنجەم بۆ ئەم ڕاستی‌یە درێژ کردووە(١٠) .

١٨ ـ نووسەر لە ( ل ٧٣ )دا بۆ گۆڤاری ( ڕۆژی کورد ) دوای باس‌کردنی چەند ژمارەیەکی ئەڵێ ( وا دەرئەکەوێ کە ڕۆژی کورد مانگانە بووبێ و ژمارەیەکی سەرەتای حوزەیرانی ساڵی ١٩١٣ یا ئەو دەورووبەرە دەرچووبێ . جا ئەوەی من ئاگادار بم ئەوەیە دوکتۆر مارف خەزنەدار پاش بینینی یەکەم ژمارەی گۆڤارە کەلە ساڵی ١٩٦٨دا بۆیەکەم جار ڕۆژی دەرچوونی ژمارەی یەکەمی دیاری کردووە ووتویەتی لە ڕۆژی (١٩)ی حوزەیرانی ١٩١٣ دا دەرچووە(١١) ، دواییش جەمال خەزنەدار لە ڕابەرەکەی دا هەمان ڕاستی تۆمار کردووەو ئەبوایە نووسەر پەنای بۆ ئەوسەرچاوەیە ببرادایە تاکوو ڕاستتر ڕۆژی دەرچوونی دەستنیشان بکردایە ، لە لایەکی ترەوە گۆڤارەکە بە ئیمتیاز هەفتەیی بووە بەڵام مانگی ژمارەیەکی لێ‌دەرچووە و یەکەم ژمارەی لە چاپخانەی حقوق ( حقوق مطبعه‌سی ) چاپکراوەو ٣٢ لاپەڕەیە(١٢) .

١٩ ـ نووسەر لە سەرتاپا بیبلیۆگرافیاکەی دا زۆر جار وشەی (چەند)و (کەم)ی بەکار هێناوە بەڵام بۆ خوێنەواران ، وون نابێتەوە کە مەبەستی دوکتۆر لەم (چەند) و (کەم)ە دا چەند بێ ئەکات چونکە لە (ل٢٢٦)دا بۆ ڕۆژنامەی کوردستان ژمارەکانی دیاری نەکردووە کە (٥) ژمارەن‌و وتویەتی چەند ژمارەیەکی کەمی لێ دەرچووە ، کەچی لە (ل٢٢٥)دا بۆ ڕۆژنامەی (ڕای گەل) ژمارەکانی دیاری نەکردووەو تەنها نووسیویەتی ( کەمی لێ‌دەرچووە ) جا ئێستا ژمارە (٧١)ی ئەم ڕۆژنامەیەم لەبەر دەستایە کە ڕۆژی ٣شەممە ( ٥ـ٩ـ١٩٦١)دەرچووە ئینجا نازانم بۆ (٥) ژمارەو (٧١)ژمارە هەر هەمان کەم وچەند ئەیان گرێتەوە ؟ نەك هەر ئەمە بەڵکو لە (ل٢٢٢)یشدابۆ ڕۆژنامەی ( ڕیا تازە ) وتویەتی کە بۆ ماوەی چەند ساڵێك ١٩٣٨ ـ ١٩٥ دەرنەچووە کە ئەکاتە (١٧) ساڵ ..

٢٠ ـ دوکتۆری بەڕێز پەنجەی بۆ هەندێ گۆڤارو ڕۆژنامە درێژ نەکردووە کە شوێنێکی دیاری‌یان هەیە وەك ڕۆژنامەی کوردستان کە لە ئەستەموول دەرچووە وسەرنووسەرەکەی ( محەمەد شەفیق ئەرواسی‌زادە ) بووەو خاوەن ئیمتیازو بەڕێوەبەری لێپرسراوی ( محەمەد میهری )بووە . ژمارە (٨)ی لە ڕۆژی ٢٩ ی‌مایسی ساڵی ١٩١٩دا بە کوردی‌و تورکی‌و عەرەبی دەرچووە بەڵام ژمارە (٩)ی لە ڕۆژی ١١ی حوزەیرانی ١٩١٩ دا بە تورکی‌و کوردی بڵاوکراوەتەوە(١٣) . یان گۆڤاری (ڕوناهی) ناو نەبردووە کە یەکەم ژمارەی لە تشرینی یەکەمی ١٩٦٠ دابڵاوکرایەوەو (٨)ژمارەی لێ‌دەرچووە وساڵی ١٩٦٢ وەستا .

٢١ ـ دوکتۆر لە (ل٢٢٢)دا بۆ ڕۆژنامەی (زبان) وتویەتی کە (ساڵح قەفتان سەرپەرشتی کردووەو دەورووبەری دوو ساڵ ژیاو بەبێ ئەمەی کە ژمارەکانی دیاری بکا ، پێش هەموو شتێك پێویستە ئەو ڕاستی‌یە بزانرێت کە هەرچەندە ( ساڵح قەفتان ) سەرپەرشتی ئەکرد بەڵام ( ئەحمەدی عەزیز ئاغا ) لە نووسەرە هەرە چالاکەکانی ئەم ڕۆژنامەیە بووە(١٤) ، لایەکی‌ترەوە دوکتۆر ڕاست بۆی چووە کە ڕۆژی (١٢)ی ئەیلولی ١٩٣٧ی بە ڕۆژی‌دەرچوونی ئەم ڕۆژنامەیە داناوە بەڵام پێویستە ئەوەیش ئاشکرا بکرێت کە ژمارە (٦٩)ی ئەم ڕۆژنامەیە ڕۆژی شەممە ٢٥ی‌مارتی ١٩٣٩ دەرچووە ، بەڵام ڕۆژی (٢)شەممە ڕێکەوتی (١٠)ی نیسانی ١٩٣٩ ژمارەیەکی تری بە (٤)لاپەڕە دەرچووەو ( عدد خاص )ی‌لە سەرنووسراوە بەبۆنەی‌کۆچی دوایی(ملكغازی)یەوە بەبێ ئەوەی‌ژمارەی لەسەر بنووسرێ ، کەچی هەر دوابەدوای ئەوە ژمارە (٧٠)ی دەرچووە لە ڕۆژی شەممە ٢٩ی نیسانی ١٩٣٩ .

٢٢ ـ ئەمانە بوون بە نووکە قەڵەمێکی درشت

هەندێ لەو سەرنجانەم دەربارەی کتێبی ناوبراو ، بەلام پێویستێشە ئەوە بلێم کە ئەم سەرنجانەی لێرەدا خراونەتە بەرچاو بە هیچ جۆرێك لە توانایاندا نی‌یە کە لە ئاستی‌بەرهەمەکەی دکتۆر کەمال کەم بکەنەوەو تەنها پێشچاوخستنە وهیچی تر ..

## سەرچاوەو پەراوێزەکان :

(١) تێگەیشتنی راستی وشوێنی لە رۆژنامە نووسی کوردیدا ــ د . کەمال مەزهەر ئەحمەد ــ بەغداد ١٩٧٨ ــ چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد ــ ٣١٦ لاپەڕەیە .

(٢) امین فیضی ــ ابخمن ادیبان کورد ــ استەمول ( ١٣٣٩ ــ ١٩٢٠ ) ل٣٤ .

(٣) هەموو ژمارەکانی ئەم دوو رۆژنامەیە سالانی ١٩٧٣ ــ ١٩٧٤ بە هەوڵو کۆششی مامۆستای ئەدیب ورۆژنامە نووس‌جەمال خەزنەدار جارێکی تر چاپکرانەوە .

(٤) ئەو دەستنوبریتی‌بوو لە دەفتەرێکی ١٠٠ لاپەڕەیی وخاوەنی ئەم باسەنوو سخەیەکی لە بەر نووسی‌یەوە، بەلام دەوروبەری سالی ١٩٦٣ شاعیری خوالێ خۆشبوو ( عوسمان عوزەیری) داوای ئەو نووسخەیەی لێ کردم تا ئەویش نووسخەیەکی لە بەربنووسێتە وەبەلام کارەساتەکانی ئەو سەردەمە بوو بەهۆی لە ناوچوونی شاعیرو نووسخەکەیش سەری تیاچوو ، لەو پێشەکی‌یەدا کە بۆی نووسرابوو ئەوەیش ئاشکراکرابوو کە نازناوی (هەمی) بووەو پارچە شیعرێکی جوانیشی‌تیا بوو کە دوو قۆلی لەگەڵ (زێوەر)دا دایان نابوو ..

(٥) بۆ نموونە کاك محەمەدی مەلا کەریم لەباتی وشەیەکی نازداری کوردی وەك (راستی) هاتووە وشەی (فاکت)ی ئینگلیزی بەکار هێناوە جا نازانم کە (راستی)مان هەبێ ( فاکت fact ) بۆ قەرز بکەین بۆ ئەمەیش بڕوانە لە رێگای ئەدەبو لەپێناوی نالی‌دا ) ١٩٧٩ لاپەڕە ( ١٩٠ ــ ٢١٠ ) .

(٦) ئەم هەولدانەی زانایەکی وەك دوکتۆر کەمال لە پێناوی ئامادەکردنی بیبلیۆگرافیایەکی دروستدا ولێدوان لە بایەخی ئەم کارە ئەو رایەی کاك ( نەوزاد ئەحمەد بێ‌کەس ) ئەداتە دواوە کە گوایا بیبلیۆگرافیا هیچ بایەخێکی نی‌یە بۆ ئەم مەبەستەیش بڕوانە رۆژنامەی ــ هاوکاری ژمارە (٤٤٢) ی‌رۆژی (٢٥) ئەیلوولی ١٩٧٨ .

(٧) بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە ــ نووسەری کورد ژمارە (٥)کانوونی دووەمی ١٩٧٢ .

(٨) لێکۆلینەوەو بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی ــ لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد ــ بەغداد ١٩٧٨ لاپەڕە (١٢) .

(٩) جبار جباری ــ تاریخ الصحافه الکردیه فی العراق ــ منشورات وزاره الاعلام ١٩٧٥ ص٦٦

(١٠) بڕوانە گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە (٧٠) ئەیلوول وتشرینی یەکەمی ١٩٧٨ لاپەڕە (٢١) .

(١١) بڕوانە ( الاکراد ــ ملاحظاتو انطباعات ــ بغداد ١٩٦٨ ص٤٤ ) .

(١٢) بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە دکتۆر مارف خەزنەدار ــ رۆژی کوردستان ژ ٥٤ ئازاری ١٩٧٩ .

(١٣) بۆ ئەم رۆژنامەیە بڕوانە رۆژی کوردستان ٤٣ ــ ٤٤ کانوونی یەکەم وکانوونی دووەمی ١٩٧٧ باسێکی دوکتۆر مارف خەزنەدار ل٣٨ .

(١٤) ئەم راستی‌و زانیاری‌یەکە پەیوەندی بە ئەحمەدی عەزیز ئاغاوەیە لە مامۆستا (عەبدوللا جەوهەر)م وەرگرتووە ..

---

به لەناوبردنی نەخوێندەواری بناغەی سۆشیالیستیمان پتەو دەبێت .

«ئەگەر دەتانەوێت بمێیننەوە، بڕۆن، بگەڕێن، بزانن: کام هەراجخانە شتی زۆر لێ هەرزانە، هەموو ڕۆژێ، من لەوێ هەراج دەکرێم».

ملت خوس کردبووەوە، شانی چەپت داتەکیبوو، پرپاسکەیەکت بە بن باخەڵەوە بوو، بە دەستی ڕاستیشت دڕت بە شاماتەکە دەدا، لەبڕ خولێکی خێرات بە دەوری خۆتدا دەخواردەوە، ئێستێکت بۆ دەکرد، سەرت وەتەکاند.. وەکوو ئەوەی گێژەنگێک قووتیدابێتو هەڵت بهێنێتەوە، چنگی ڕاستت لە تۆزی ئاسمان گیردەکرد، بە مەچەکتەوە لوولت دەدا، ئەنجا چنگت دەکردەوە، دانەکانت بە چێژا دەبرد، چرچیو لۆچی دەمو چاوت تێک هەڵدەتزان، هاوارێکی سەبراو دەیزرنگاند)ـ بیوەستێنن، بیوەستێنن، خێراکەن، فریاکەون بیوەستێنن (لە هەر چوار لاوە لە خۆمی شێتێتی دەگیرایت، دووبارە بەرەڵای ئەونەوە دەکرایتەوە.. ئاهێکت دەهاتەوە بەر، تۆزێک دادەمرکایتەوە، سەرت دادەخست، هێدی هێدی دەجوڵایت، لە خەڵکەکە دەجوڵایت، لە خەڵکەکە تاک دەکەوتیتەوە، ئەمجا بۆ خۆت کەنارت دەگرت، چفرێکت بە چوار دەوری خۆتدا دەکێشا، پرپاسکەکەت لە ناوەڕاستیدا دادەنا، لە تەنیشتیەوە چوارمشقی دادەنیشتیت)..

«ئەها، ئێستا زۆر چاکە، کوڕە خۆ وای لێهاتووە، کە لە دەم سەگ بەر دەبێت، دەکەوێتە دەم گورگ، شێتە، شێتە.. قسەی قۆڕ تو غیرەتتان کامتان کە من شێتتر نین، ها بۆ قسە ناکەن بۆ؟!» (ئەمجا گرێی پرپاسکەکەت دەکردەوە، بە کاوەخۆ بەکاڵات دەکردەوە، ڕاتدەخست ئاپلکی کاسەسەرێکی سپی دەردەکەوت، هەر ئەم دیوو ئەو دیووت پێدەکرد، هەڵت دەسەنگاند).

«دڵ لە دڵ مەدە. خەونە سەوزەکانت، لە سەر شانۆی ئاوازی خەمەکانمدا سەما دەکەن، هەر پێیان دەگەینم».

(تووتکەسەگێک لە دوورەوە دەحەپی، پرپاسکەکەت پێچاوە.. شوێن دەنگەکە کەوتیت هەرهاتیتو هەرنەگەیشتیت، حەپەی تووتکەکە بڕا، دانیشتیت، چفرێکت بە دەوری خۆتدا کیشا، پرپاسکەکەت کردەوە، کاسەسەرەکەت خستە ژێرسەرت، لەسەر پشت ڕاکشایت).

«ئەمتێرەکان، ئێوە بە شایەتبن، کە ئەم کەللەسەرەم کردووە بە سەرین، تەنیا لەبەر خۆشەویستیەو هیچیتر».

(خۆت خستە سەر لا، ئانیشکت بۆ دادا، دەمت برد، کەللە سەرەکەت ماچکرد).

«لێم زویر نەبیت.. کاتێ ئەوان تۆیان دەکرد بە سەرین لێت



دەترسان ، هەمووی ترسی‌بوو ، بەلام من‌خۆشم دەوێ‌ی .. حەزیش دەكەی لێرە بار دەكەین » .

كەللەسەر هەلچوو .

— نەكەی شێتە بار بكەیت ، گەوج نەبیت .. شوێنەكەت باشە .. ( بزەیەك گرتیتی « ئم .. م .. م .. گالتەم كرد ، ووتم بزانم چی دەلێ‌ی .. تۆش بار بكەی من هەر بار ناكەم » . سەرت خستنەوە سەر كەللەسەرەكە ) .

« مالت ئاوبێ شێتی .. تۆ وەكوو قەرەج وایت ، كوێت پێ‌خۆش‌بێت لەوێ هەوار دەخەیت » .

( خەو بردیتی‌یەوە ، خۆروبان گەرم بوو ، هەستایت ، نواڕیت ، یەك دوو زەلام بە دیارتەوە وەستاوون ) .

— رۆژباش .

— ...

— دەمانەوێت بت‌ناسین .

— بم‌ناسن ، یان بتان‌ناسم !

— بت‌ناسین .

— باپێتان بێژم ، دلگیر مەبن ، رەنگە قسەكانم بە دلی‌ئێوە نەبێت

— فەیناكات .

— دەباشە .. من شێتم كوڕی وێتم .

— كۆیندەریت ؟

— كاولەساریم .

— تەمەنت چەندە ؟

— درێژە ، یەجگار درێژە ..

— یەجگار درێژ یانی چەند ، هەر وا بەمەزەنە .

( ئاورێكت داوە ، كەللەسەرەكەت بە دەستەوە گرت ، دەستی یەكێكیانت گرت ) .

— لێرەوە تەماشا بكە ، باش سەرنج بدە ، ئا ئەو خەتەت دیوە .. ئەوە تەمەنی منە .. من‌لەوێ هەڕاج دەكریم ●

— هیچی لی‌تێ‌ناگەم .

— شێتی ، بەلام هێشتا ماوتە .

— باشە ئەم كەللەسەرە چی‌یە پێت ؟

— ئەمە مێژوویەكی وێنەدارە .

— مێژووی چی ؟

— مێژووی ئەو رۆژەی تۆیان تیادا كرد بە پرد .

— من ! من هەرگیز نەكراوم بە پرد .

— با ، باگەوج مەبە .

( كەوتیتە خۆپێچانەوە ) .

« ئەوەندەم بەسە،دلم رەچەت بوو ، شوكو پەتاكە بلاوبووەتەوە با بڕۆم بۆ شێنێكی دی » .

( بە دەم خۆپێچانەوەوە ، ئاوڕێكت لێ‌دانەوە ) .

— ئەگەر ئەتانەوێك بمبینەوە .. بڕۆن ، بگەڕێن ، بزانن : كام هەڕاج خانە ، شتی زۆر لێ‌هەرزانە ، هەموو رۆژێ ،



# دلۆرابە دلۆرابە

## هەلبەستا رەوانا
## نەقیێ تەیران
## هوزانەکا نەبەلاڤکری

عبد الرقیب یوسف

ئەڤ هەلبەستا هە ژگرنکترین‌و رەوانترین هەلبەستن شاعرێ کوردێ نەمر فەقێی تەیرانە هەلبەستەکی گەلەك سازو رەوان‌و خوشە گەلەك نیزیکی شیوەو تەخلیتی فولکلوریە.هندەك جاران مرۆڤ دبێژی سترانە وئاشکەرایە کو هەلبەستێن تەیران نیزیکی تەخلیتا ئاخافتنا خەلکێیە بێ سەخت بون دووشەو مانـاو ناوەرۆکێدا وئەڤ هەلبەستە « دل‌و رابە دلو رابە ڤەکەچاڤان کو ئێڤارە » دڤێ بابەتێدا ژهەمی هەلبەستێن وی پێن مە دیتی بتر دکەڤێ بەرچاڤ .

فەقی دڤێ هەلبەستێدا پەسنەکی ( وەسفەکی ) باش یا پاییزێ دکی ودبیژی : بهار چو وپاییز لڤان وارو زوزانان پەیدا بو خەزام زەربون‌و وەشیان لبن داران پەلچم وپەلك سورگول ریحان‌و بەیبون‌و ئاسەمین‌و هەڤری هەمی هلوەرین‌و نەمان زوزان‌و هەوارگەی درەنگین تێك چون نازك‌و تەڕ وکو کەلەمبەرێ لیهات سرو سەرما هاتو خەزامێ دارو درەختان سەرئەڤراز بو زکی ئاسمانی پێچاو بر .

مەخسەدا فەقی ئەوە کو بهارا تەمەن عومر چو
وپیربون بەسەردا هات وگول‌و بەیبونا گەنجی‌و
لاوینی هلوەراند ...

ئەوا بابەتا گوتنە ئەڤ هەلبەستە درێژترە ژهەمی هەلبەستێن ڤێ شاعریە پێن کو کەتنە بەرچاڤێ مە چونکە ژ ( ١٥٢ ) مالك پێك هاتیە بەلێ دیارە هندەك خەلەت تیدا هەیە ئەگەر چەند کەمن ومە نە دکاری وان خەلەتان سەراست بکێن چونکە دانەیەکی‌تر ددەستێ مەدا نیە وتەنیا ئەڤ دانەیە مە هەیە وئەوژی دگەل هندەك هەلبەستێن‌تر پێن تەیران‌و هندەك

موزانڤانێن‌تر هاتیه نڤیسین ددفتەرەکیدا زلاێ عبدالباری مەینیی ڤە ئەوێ کو گوندێ وی « مەیتیس » دکەڤێ دهەرێما ( مکسێ ) یاکو فەقێی نەیران تێدا ژیاره یان نیزیکی ڤێ‌هەرێمێ‌یە ژبەرڤێ یەکێ ئەو هەلبەستێن ئەوی نڤیسینە گەلەك بریك‌و پێك دکەڤن بەر چاڤ وەەروها راسترو تەواو تر ژی هەر ودکو دیار دبی ژبەرامبەرکرنا هندەك ژوان لگەل هندەك دانەیێن تر یێن ئەو هەلبەستان ئەوێن کو لنك مە هەنە ژبەرڤێ یەکی ئەڤ دانەیە ژهەلبەستا « دلو رابە دلو رابە » ب بەرکەتی‌و گرانبها دزانم . مە نەبهیستە کو ئەڤ هەلبەستە هەتا نهو هاتبێ چاپکرن لەورا ئەم پێشکەشێ خوندەواران دکێن .

**دلو رابە دلو رابە**
**ڤەکە چاڤان کو ئێڤاره**
**نەزانو بەس دخەودابە**
**بنەومێ‌را مەبە یاره**
**لخو شیرین مەکە نەومێ**
**ژنەفسا خو بکە لەومێ**
**مچە نیزیکێ ڤێ قەومێ**
**ڤەوی نەمو فعلە خەساره**
**دلو نومێ مە ژێ بەحسە**
**بەیانا غەفلەتا نەحسە**
**نەهشیاری گەلەك تەحسە**
**مەنێڤ خابە کو مرداره**
**دلو رابە ژڤێ خابێ**
**وەکی باپیرو وەك بابێ**
**نەم ژی دێ بچنە تورابێ**
**بیال باخویو ڤەر واره**
**بنێر باخویو ڤەروارێ**
**بنێرە چەرخو روزگارێ**
**لتە رۆژ هاتە ئێڤارێ**
**تە نە عەقلە نە هشیاره**
**ئەگەر عەقلێ ومرە جەنگێ**
**ببێژ نەفسێ حەیا کەنگێ**
**تو غافل بی بڤی رەنگێ**
**ئەیا گەهلێ نە گوهداره**
**چ وەی سستی چ وەی گەهلی**
**تو خو یەکجار ژخو مەهلی**
**مەبە خەرگوش دنێڤ دەحلی**
**صەیاد دێ بێنە چارداره**

**صەیاد دێ بێنو تەراکە**
**مەبێژ نانو مەبێژ ناکە**
**مەچالە ئەمو بغوغاکە**
**بنێر جارەك چ هەمواره**
**بنێر جارەك چ بان کینە**
**ژ نەومێ خو بهەش بینە**
**دنێ قەتلە دنێ خونە**
**دنێ گەردونو رۆژگاره**
**دبارن شیر ژگەردونی**
**ژخەمو رابە دەمەك رونی**
**تو ناترسی ژئێشونی**
**دبندا ئاگرو ناره**
**دنێڤ ئاگر دنێڤ پێتێ**
**لسەر سهلێ خەوا کێ تێ**
**نەجەمل گوریە یەڤین پێتێ**
**تە نە فکرە نە ئەفکاره**
**تو ڤان فکران چرا ناکی**
**تو ناڤێ خو ژخەو راکی**
**کو ئێڤار هات چ پەیداکی**
**ئەیا مەی مەستێ مەی خوره**
**خەواقەلبێ عەمەل بێ بێ**
**گوهێ خەلقێ کەروگێژبێ**
**مچە پالە لسەر بانگێ**
**خەوا بێ جێ ڤەوی عاره**
**خەوا بێ جی ڤەوی کوسە**
**مە نە ناڤە نە ناموسە**
**دکانا مە ڤەوی روسە**
**دبێژن خواجە ڤەرداره**
**دبێژن خواجە بێ دەبره**
**دمەعنیدا دکان ڤەبره**
**تەژێ توزە تەژێ غەبره**
**صەرەب تەنگە تەژێ ماره**
**تەژێ مارە تەژێ موره**
**ڤەوی تەنگە ڤەوی کوره**
**ژخو ڤەبرێ نەکە دوره**
**لەوی مالە لهەر واره**
**بویە پایز لڤان واران**
**خەزام ومشیان لبن داران**
**لمن چەکەمن گەلی یاران**
**لێرگان بویە خوساره**

حەزام زەر بون ژخوساری
صەفا ناکەن لەڤی واری
ژ بەر سەرمێ وها شاری
هەوائی زەر کرن دارە

خەزام زەر بون ژسەرمائێ
رەڤی رەونەق ژدونیائێ
ژبوش ئاڤان گوشین نائێ
نەشەت مانە نەجو بارە

نەمان ئەنهار دڤی واری
دبن کیم بون شەتێ جاری
چونینن بوتە غەم خاری
کو لوێ بویە بهارە

بهار بوری وئاڤ کێم بون
هەزاران باغ لبرجیم بون
پاییز هاتو گول کێم بون
وەشاندن بەلگو مانخارە

نە بەلچم مان نە سورگول مان
نە ریحان مان نە سونبول مان
نە هەڤری مان نە هاڤال مان
تراب کێم کرن یارە

تنێ من حەیف لوان تشتان
لبەیبون لبەشتان
خوزی ئەڤ رەنگ نە نیڤشتان
ژئسمینێ دنامدارە

نە چیچەك مان نە ئاسمین مان
نە زوزانێ درەنگین مان
نە کوین دخوش خون مان
نە نیسان ما نە ئادارە

دلو بورین ژنیسانێ
هەوای وان مەهان کانێ
وێ ئەیلول لزوزانێ
نە کانون ما نە جوبارە

ژجوباران گیا تەڤ چو
نەتیڤو نازکو تەر چو
وەکی بائێ کەلەمپەر چو
گەلو ئەڤ با چ دژوارە

لمە بانێ کرە گازی
خەزام پێچان بر نەڤرازی
مقیم ئەڤ ئاش لڤی سازی
رشاندن سونبولان ئارە

دبارن ئار ژئاسمانی
ژدوما چەرخو دەورانی
گری ئاڤێتە رەیحانی
بخور نائێ ژبولفارە

ژبولفاری درەنگ دائی
ژمخموری دپێچائی
قماش کەفنە بەکێرنائی
رونێ هیمی کوعەیبدارە

رونێ هیمێچلسالی
دنیڤ بوخچەئێ رەشکالی
دەڤیف باری لەپەرتالی
هەمی تێکبونە جوتارە

لمە پەرتال کەتە ئاڤێ
کەڤا بەجرێ گها ناڤێ
سیامەخمور لەبەر تاڤێ
سپی بو رەنگو روکارە

سپی نورە ژهدایاتە
رەشی رونگە ژظولماتە
شوکور شەڤ چو وروژ هاتە
خودا غەسالو قەططارە

غەسال نەرم کرنو شوشتن
لەبەر تاڤێ بدوم هشتن
برەنگ پێر رشتن
شوکوردارین ژرجەبارە

شوکوردارین ژڤی حالی
هوائی لەولبا سالی
وەشاندن بەلگ ژئالئالی
نە رەنگ مانە نە روخسارە

مە نەرەنگ ما نە نە تاقەت ما
مە نە خەو ما نە راحەت ما
مە نە بێهن ما نە سبرەت ما
هەمی بورین دنێ سارە

دنێ مەهدەو مەهلوکە
وەکی لەعبو لەیزوکە
چ زانن طفلو زاروکە
فەلەك چەرخەو دەورانە

فەلەك چەرخەو دورانە
مثالێ مەوجێ بەحسرانە
مەعاشێ ئەهلێ شەیطانە
دنێ دەورەو دەورانە

دنی قنجه ژمێرانرا
عەجەب مولکه ژشێدانرا
کو ئاڤا کەمن ژخێرانرا
عەجەب مەزرەعو عقاره

دنی قنجه تەژی شێربن
ژخێرانرا دخوشمێربن
نه مثلی من دبی کێر بن
دبی کەسب دبی کاره

نەیا بی کەسبو بی خێره
یەقین عەقلی ڤه تەخسیره
ته با جوان دا یا پیره
تو دەست ژێ بەرده سەحاره

دلو یا پیر بکێر نائی
ئەگەر عەقلیو زانائی
مەبه یولداشی دونیائی
نه یولداشەك وەفاداره

دنی خەلقنف بکی مایه
بەلی قەنجەمو مزرایه
ژخێرانرا خودا دایه
خەبات کار بن کو ئەڤ جاره

دو جار نائێنه دونیائی
چەلاپا خوش هەرو نائی
بگیر قوتی خو زانائی
نها ئەوقات دبێت چاره

تو قوتی خو نها چارکه
زەوادا ئاخرەت کارکه
بلەزینه وزو بارکه
هنگی سوکەمو بازاره

دنی شەهره دنی سوکه
دنی پیره نه توو بوکه
هەچی مێرێ کو ئەو شوکه
گری کرتو نها خاره

ته ئەو خارن هەمی یەك سەر
نه دائی کەس ڤه تو مەفەر
ژئادەمو تا پیغەمبەر
ڤەشارتن جوملە یەك جاره

نه ئادەم مائو نه شیش ما
نه نوح مائو نه ئدریس ما
نه یوسف ما نه جەرجیس ما
نه ئەیوبی برینداره

نه ئەیوب ما نه یەحیا ما
نه هارون ما نه موسا ما
نه عیسا ما نه ئەحمەدا ما
نه مریەم ما نه چاریاره

نه چاریار مان نه هەڤال مان
نه ئەصحابی دغەمخوار مان
نه عالمی دهشیار مان
نه جالیسی وەفاداره

نه جالیسو نه ئەقراط ما
نه طالیسو نه بقراط ما
نه ذوالقرنینو مرئات ما
نه جومجوم ما نه ئەخیاره

نه ئەفلاطون ولوقمان ما
نه داودو سولەیمان ما
نه فرعەونو نەهامان ما
نه سولتانی دکوباره

نه جمشید ما نه روستەم ما
نه قەیسەر ما نه حاتەم ما
نه ئاصف ما نه خاتەم ما
نه مالخوو نه سەرکاره

نه سەرکار ما نه سەردار ما
نه یولداش ما نه هەڤال ما
نه هارون ما نه ماروت ما
دی ئاخی مانه روخساره

نه غالب ما نه مەغلوب ما
نه طالب ما نه مەطلوب ما
نه ئەولادی دیەعقوب ما
کەڤا بەحرێ یوسف خاره

دنی پیره نه مەعقوله
ئەوێ پی خوره ملخله
ئەو پشت قوره صفەت غوله
قەوی تەنگه دەنگ هەفتاره

ژهەفتارێ دلێڤ شوره
عەجوزه کەڤنه دەڤکوره
هەڤو رەنگه هەشین پوره
هەچی ڤێ کەته ئەو خواره

هەچی ڤێ کەت ئەو خوارن
گەر عامینه گەرکەسارن
هەمی ژبەر ته بهاوارن
ئەیا غولو تەخەمل خواره

تـوی غـولا بـەیابانـێ
حەشـم خـەلقێ مـەدی کانێ
تـە خـ ـارن پورێ دفـێ خـانێ
نـە سـولتان ما نـە خونکاره

نه خونکارێ خـودان تەخت ...
نه کوبارێ خـودان تاج ...
نەکوفارێ خودان سـەخت ...
تـوی عیسـا کـو نە...

دنـێ پـیرە ... ـسـا دی
بشـکلێ و ... بـو راضی
تـەلاق داب... لبـەر قاضی
ژسـەردانێ ... ـەرهەفساره

بوێ سـوندا مـەپێ خاری
ئەسـەر ناکـەم سـەرهەفساری
تونـەڤ پیسـی تونـەڤ عـاری
تە نە شـکله نـە دیـداره

دنـێ بوکا ئـەبوجـەهلـە
لەنك مـە عاصـیان نەحلـە
لعـەقلێ عاقـلان تـەحلـە
لنـك عیسـا کـو مـرداره

دخـوم سـونـدێ بباب ئـادەم
بئنجیـلێ کـەفا دادەم
ئیـدی مـەیلێ بتـە نادەم
تە نـە عـەقلـە نـە ئقـراره

روحێ عیسـا خـودێ کەس کر
دنـێ ناس کـر وژی بـەس کر
موجـەرەد بـو خـوژێ حفظ کر
دنێڤ خـەلقێ خـو قافـاره

کـەسێ عەقله کەسـێ مـەرده
دبەر کو هێژ نـە بو عـەرضـە
ژڤـێ مـەیلا خـو ژێ بـەرده
چـرا ئاخ مـاکـە قـەهـاره

دنێ مـەهـده دنێ ماکـە
دنێ تەنگـە دنـێ خاکـە
بئـەولادان ئـەبـەد ناکـە
ئـەوا بـێ رەحـمو دژواره

ئـەوا بێ رەحمو بێهـن تـەنگـە
هـەروژ ڤالـە هـەروژ چەنگه
دەما لێخـە خـو ئەڤ دەنگـە
نـە دل سـوژه نـە غـەمخواره

نه غـەمخواره نـە دلسـوژه
ژوێ بـائـێ درەنـگ روژه
بڤـان حـالان گـەرو گیـژه
بـلاوات‌و سـەیێ هـاره

بـلاوات‌و سـەیێ دینـە
دنـێ کـەڤنە ژمێژینـە
هـەروژ دوره هـەروژ کینه
نەوەی میلـەتە گوشـداره

هەروژ گوچـە هـەروژ چونـە
ژ دور مـەکـر کسـونـە
بنێڤ قەبـران ڤـەدا ژونـە
لـەوێ کر وشـتە تگهـاره

نەوێ خـەریف شـنا ئەو تێـدا
هـەروژ جـارەك بنێر پێـدا
کـو رازانـە دئاخێـدا
دخاموشـی دبـێ چـاره

د خامـوشـێن د رازائـێ
د مـەهجـورێن ژ دونیـائـێ
چـەوا دەنگـك ژ وانائـێ
ژوان فکـران فـەقـی ژاره

ژوان فکران حـەقـە ژاریـن
حەیا کەنگـێ نـە هشیاریـن
ترسـم بمریـن گونەهکاریـن
دبـێ توبـەو ئسـتغفاره

هەروژ چـەند جـار ببێ توبـە
دبـەر گوهێژ نە هـات نوبـە
داو هشیاره بـێ خـەوتـە
نه هەڤال مـا نـە سـەرداره

ئـەم دبـێ وان هـەڤـالان
بەقـین دێ بچنـە وان مـالان
ئـەوچەنـد رازێن دوان چـالان
حەیا بێ سـەرمـە کاخـواره

ئـەم بچـن هەڤـال بمینن
میـموح بـیرا خـو بینن
فاتحـان ژیـرا بخـوینن
حـەوجـەئـو دور ئنتیزاره

# وێنەیەک

"بۆ منداڵانی نەتەوەکانی ئێران"

چوار منداڵ..
تورک و فارس و
عەرەب و کورد
بە هەر چواریان
وێنەی پیاوێکیان دروست کرد:
یەکەم: سەری
دووەم: دەستی،
سێیەم: لەشی و قاچەکانی
چوارەم: چەکی،
کردە شانی!

شێرکۆ بێکەس
تشرینی دووەم ١٩٧٩

# «گەشت .. یا هەڵاتن»

## دلدارێکی نامۆ

عبد الکریم حمید

● یاخی‌بوون تۆلەسەندن ، گۆشەگیری ... هتد هەڵوێستن هەڵوێستن بەڵام جیان، کاتێ مرۆڤ تووشی کارەساتێك ، بەسەرهاتێك دەبێت هەڵوێستی بە پێی لێکدانەوەو بۆچوونو سایکۆلۆژی ناوەوەی خۆی‌و بارودۆخی دەرەوەی دەگۆڕێت .. هەیە بەرەنگاری ڕوداوەکە دەبێتەوەو بەرگری دەکا جا چی ڕاستبێ وچی ناڕاست ( شەلم کوێرم )و دووریش نی‌یە بە پێی ڕێبازو نەخشەیەکی دیاری‌کراو .. هەیە چاوەڕێی بارێکی گونجاو دەکا بۆیە خۆی مەڵاس دەدات‌و بەنیازی ئەو ڕۆژە خۆی ڕێك‌دەخات‌و ڕێ‌ڕەوو نەخشە بۆ باشە ڕۆژێکی دوور دەکێشێ و هەشە گۆشەگیر دەمێنێتەوەو ناخی خۆی دەخواتەوە ، لەوەش خراپتر ڕەنگە ئەو تاقمە یا ئەو مرۆڤە بێ کە سەری خۆی‌هەڵدەگرێ‌و هەڵدێ .. دەیەوێ ئەو بەسەرهاتە لە بیرخۆی بباتەوەو بەهەر شێوەیەك بێ ڕزگاری لێ‌بێ یاهیچ نەبێ گوێی بەو سەدا ناسازە نەزرنگێتەوە ڕەنگە ئەم ورە بەردانە لاوازترین ، بگرە بێ‌دەسەلاترین هەڵوێستبێ کە مرۆڤ ڕێی پێ‌ئەبا ..

بێ‌گومان ئەمە دیاردەیەکی زانراوو ئاشکرایەو بە شێوەیەکی گشتی هەموو مەسەلەیەکی پێ پێوانە ئەکرێ‌و لە شتە تایبەتی‌یەکانی ئادەمیزادوە دەست‌پێ‌بکەین هەر ڕاستە . ئەو ڕەفتارەی کە قارەمانی چیرۆکی ( گەشت )ی (١) ( شیرزاد حسن ) دەینوێنێ یەکێکەلەو هەڵوێستانەی کە باسم‌کردن بگرە لاوازترینیانە ئەویش سەرهەڵگرتن‌و ( هەڵاتن ) ە کەیە کە نوسەر بە ( گەشت ) ناوی بردووە .

دەبێ هەر وەکو هەڵوێست چەند شێوەیەکی جیاوازی هەیە ( گەشت ) یش هەر بەو جۆرە بێت ئێمە پێ‌ی نازانین ئەگینا ئەوەی شکی تیانی‌یە ( گەشت ) سەیران‌و کات بردنەسەرە بەڵام بۆخۆشی‌و ڕابواردن دوور لە گیروگرفت‌و تەنگ‌وچەڵەمە کە مرۆڤ دەست بەگەشت کردنیشی دەکا بەخۆشی سەری خۆی دەیکاو بەنیازی چەند ساتێکی بەختەوەرو دڵ‌گوشادی نەك دەردەسەری پاڵی پێوەبنێ‌و تەنانەت لەو گەشتەشدا هەر بەو ژان‌و ئەشکەنجانە بتلێتەوە وەکو قارەمانی ئەم ( گەشت ) ە بەسەریا هاتووە

★ ★ ★

قارەمانی ئەم چیرۆکە بەیانی‌یەك ( پشت لە شارو ڕوو لە دەشت هەنگاو دەنێ ) دەست بەو گەشتە پڕژانە دەکات یا باشتر بڵێین هەڵدێ‌و (هەڵاتن) ەکە چەند هۆیەکی لەدواوەیە، کە گرنکەکانی دووانە ئەو دو هۆیەش لەهۆو باری‌تری جۆراو جۆر جیا ناکرێنەوە . لەوانە بە شودانی ( چیمەن ) ی دەزگیران و هەروەها دوورکەوتنەوە لەژانە سەرەی شارو ژیانی ئاڵۆزاوی شارستانیەتی تازە ، دیسان ( هات گوڵ بچنێ ، گوێ بۆ زاقو زیقی باڵندەکان ڕابخا .. نەرمەشەڕێکی ئەم بەیانیەی لەگەڵ دایکی لەبیرکا.. بۆ چاوی زەردی ئەو فەریکە کچە بگری ، هات تامی توتن لەژێر زبانیابکوژێ .. لەهاش و ورشی ماشینەکان ڕزگاری‌بێ .. ) ( ئیمرۆ چیمەن ئەدرێ بە شو .. )

وەڕس‌بوون لەشارو هەڵاتن لەژیانی نوێی شارستانیەتەوە دیمەنێکی دوبارەکراوی چیرۆکێکی ( رەئوف بێگەرد ) ە (٢) ــ خالێك لەپاش ژمارە ــ هەر چەند مەبەست‌و ئەنجامیان جیاجیایە بەڵام لە هۆکان‌و جۆری بۆچووندا یەکدەگرنەوە .

قارەمانی گەشت کە ئەو هەڵوێستەی هەڵبژاردو ڕێگەیەی گرتەبەرو ڕوو لەو دەشتە چۆڵەی‌کرد وابزانم جۆرە بێ‌دەسەلاتی‌و کەمی‌و لاوازی‌یەکە لە کەسێتی‌ی ( شخصیە ) و نەیتوانیوە ئارادەیەکی ماقوڵ مامەلە لەگەڵ ئەو بارەبکات کە ناشتوانێ ڕوو بەڕووی ئەو ڕاستی‌یە ( واقـع ) بێتەوە و بەرهەڵستی بکا ناچار پەنا دەباتە بەر ئەو ڕێگەیە ( کە بەلایەوە چارەسەرە ) ، دەیەوێ خۆی بزربکا،

دووره پەرێز بوەستێو کارەساتەکەش بخاتە لایەنە هەست پێنەکەرەکەوە ( لاشعور ) و لەوێدا حەشاری بدات کە بێگومان مرۆڤ بەو حاڵەش ڕزگاری نابێ چونکە بێئەوەی هەست بەخۆی بکا ئەزیەتی دەداتو هەر سات ئەساتێ لە ناخیا دەجوڵێتەوە وەکو خوو ڕەوشتو ڕەفتاری نائاسایی سەرهەڵئەداو تووشی گرێی سایکۆلۆژی دەکا . قارەمانی ( گەشت ) عاشقە ، دلدارە بەڵام دلدارێکی دۆڕاو ، بەزیو ( کە دەسەڵاتی خۆی تیا نییە بەڵکو قوربانیی نەریتی کۆمەڵەکەیە ) ڕوو دەکاتە ئەو دەشتە پانو بەرینە سروشت بەهەموو مولکو دارایی‌یەکیەوە باوەشی بۆ دەکاتەوە ، هەر دیمەنێکی ئەو سروشتە یابڵێین بچوکترینیان ـ گوڵ ، باڵندە ، بەرد ... تەنانەت شتە مردووەکانیش بەلای ئەوەوە چیرۆکن هەر یەکەیان بە ( فلاش باك ) دەیگەڕێنێتەوە بۆ چیرۆکێکی ڕابوردوی خۆی .

لەو گەشتەدا ڕەوشتو ڕەفتارێکی ڕۆمانسیانەو بیرکردنەوەیەکی سۆفییانە دەنوێنێ، چەند وێنەیەکی هەڵسو کەوتو دیمەنی جۆراو جۆر دەهێنێتەوە کە ئەو سیماو مۆرکە ئاشکرا دەکەن : ( خۆڵەکەی ژێر پای دەستی لەگەڵ بۆنی گوڵ تێکەڵکرد ) ( چەند بەردێکی گرتە قوچەکی تازە کێلکەکان، گوڵە نیسانەك لە ژێر پای پلیشایەوە..ڕەنگی خۆڵی وەرگرت) ( لەپڕ سالمەی کرد .. ڕووی هێلانەیەك دوو هێلکە هات نەرم نەرم بە پەرۆشەوە وەك کەسێ دڵێ خۆی هەڵگرێ .. دانە هێلکەیەکی خستە ناو لەپی .. هی کام باڵندەیە .. ؟ ) ( قاژو قیژی باڵندەکان ترساندی هێلکەکەی نەرمتر خستەوە هێلانەکە .. بەتەك کۆمەڵە سەگێکا ڕابورد .. لێی ترسان ، لێیان ترسا چەند نیگایەکی پڕ لە خزمایەتیو خۆشەویستیان گۆڕیوە) ( بگرە ئەو شتە مردووانەش هەر یەك چیرۆکێکی خۆی هەیەو .. سەرەتاو کۆتایی .. بە هەردو لاوە .. کومیدیاو تراژیدیا ) ( گوڵێکی شێواوی هەڵگرت .. وتی ، دراوسێتی زبڵخانەت چۆن بۆ ئەکرێ ) .. لەگەڵ چەند وەسفێکی ڕوتی تری سروشتو باسی فرمێسكو گریانو پێکەنین .. ئەمەو جگە لەچەند لێکدانەوەیەکی خەیامیانە ، کاتێ کە لە لایەکی زبڵخانەکە (کەکۆتایی گەشتەکەیەتی) کرۆشکە دەکا چەند شتومەکێکی کۆنو یادگاری ڕۆژگاری ڕابووردو دەدۆزێتەوەو بەو پێیە لێکی‌دەداتەوە ، ئاخۆ ئەم شوشەی بیرەی مل‌شکاوە مێزی چەند دلداری ڕازاندۆتەوە ، ئەو پاکەتی جگەرەیە ، ئەو پێڵاوە ، ئەو ئەسپە تۆپیوە ، ئەو ئەنگوستیلە ژەنگدارە چیان کردوەو بوون بە باعیسی چی .. ؟ ! . هەندێ لەو وێنانەم بێزیادە بەتایبەتی هێلکە هەڵگرتنو دانانەکەی، دیارە نوسەر ویستویەتی بەم وێنەیە دو نیشان بپێکێ ، یەکەم ئەوە بسەلمێنێ کە مرۆڤێکی لەخواترسە ، زیانو زەرەر نابەخشێ و بەرێی خوێدا دەڕوا هێمنو لەسەرخۆیە .. دووەم ، ئەوە پیشانبدات کۆمەڵ جارێ لەو جۆرە کەسانە ( واتا لە دڵۆڤانەکان ، بەرەحمەکان ) بێبەش نییەو تەواو قڕتی تێنەکەوتووە ، هێشتا لەو پیاوە چاکانە بن بڕ نەکراوە و نەگەیشتۆتە ئەو ڕادەیەی دەستی لێبشۆین .. نە .. ئومێد هەیە بەڵام .. کەمن .. زۆر کەمیش چونکە بەلای ئەوەوە سەرجەم ئادەمیزادی ئەمڕۆ گۆڕاون .. تەنها بایەخ بە روکەشی مەسەلە دەدەن ، پلەی هۆشیارییان نزمە ، گزە لە هەڵەی گەورەو خواستو ئارەزوی پوچەڵدا خنکاون هەڵەداوانن ، بگرە زیانبەخشن چی بەکردەوەو چی بە ڕەفتار ورەوشت ( لەدوایدا دێینەسەری ) .

★ ★ ★

ئەو دلدارە کە بەدوای ئەو عەشقە سۆفییەدا وێڵە ( یا نوسەر دەیەوێ وایپیشانیبدا سۆفییە ) بەدەست ئازارێکی ترەوە گێژ دەخوا یا باشتر بڵێین ، لە نەخۆشییەکی تری سایکۆلۆژی بێبەش نییە ئەویش توێنیەتییەکی تیژی سێکسە ، چاوبرسی ، بێبەشی بەوەش ناهەقی ناگرین چونکە لەدەستی خۆیدا نییە ، وا دیارە لە مێژەوە بە هۆی باری خێزانو دۆخی دەورو بەریەوە بە دەست ئەو حەشاردانەوە تل‌دەخوا بۆیە ئێستاش هەروێنەیە کە چاوی پێدەکەوێ ، یەکسەر بە ( سێکس ) لێکی‌دەداتەوەو هەر دیار دەبەك هەر بەسەرهاتێك تووشی دەبێ دەیگەڕێنێتەوە سەر ( سێکس )ەکە تەنانەت شەپۆلی هۆش ( تداعی )و خواستو خەونو ئاواتەکانیشی هەر ( سێکس )ن .

خەون بەوەوە دەبینێ کە لە دڵیا ، ( چۆپییە ، ڕمبازی کچانی ڕووتو کۆکە لە ژورێکی تەنگەبەری پڕ ئاوێنە ) بەوە زۆر گەشکە

دەیگرێو ئەو پەڕی هیوای دوربەڵی .. مەزنیو گەورەیی بەلایەوە هەر ئەوساتانەیە : ( بەرزە پیاوی ئەو ساتەی خۆت بیت ) .

وڕێنەو بیرکردنەوەکانی هەر ئەو بابەتەن ( ساتانی دەستگوشین وڕاموسان ) ( سەمای شەوقو حەزو توانەوە ، کەفکردنی شیعرو سۆزو ماچو گەشکەگرتن ) لەیەك جوونی دیمەنەکان وەك سەماکەرێکی بالیە سێجار بەدەوری خۆیا سوڕایەوە ) .. لێکدانەوەکانی ، کە شوشەیەکی بیرەی ملشکاو دەبینێ:

ئاخۆ مێزی چەند دڵداری ڕازاندۆتەوە ، مرچەی چەند ماچ بە سەریا باریوە فستەفست ، ئاخونۆف ، وردەهیواو سکلاو نزاو زان خەوی سەوز ، گۆرانی سور ) ( ئەم ئەنگوستیلەیە هی چی خاتونێکە ، دڵی چەند سمێل سوری پێوە بەندبووە ) ( ڕۆژێ چەند باڵندە مرۆڤێ یا مرۆڤی باڵندە بەیەکا ئەکەوتن لەسەر تاقو پەنجەرەوبانی ـ حەمامی ژنان ـ باڵیان ئەشکا ... و زۆریتر .

دیارە تووشی ئەوگرێ سایکۆلوزیە بووە بۆیە ئەو ڕەفتارەش کە لێی دەوەشێتەوە ڕاستگۆیی تێدا بەدیناکرێ یا باشتر بڵێین دیمەنی ڕاستەقینەی ئاخی خۆی نییە .

★ ★ ★

تێکرا ( شێرزاد حسن ) لەم چیرۆکەدا ویستویەتی پەردە لەسەر چەند دیمەنێکی ناڵەبارو ڕزیوی کۆمەڵ ڕامالێو لەتۆی ئەوەدا ( بەشێوەیەکی نادیار بەڵام زیرەکانە ) چەکوشی خۆی دەوەشێنێ ( زۆر ڕقیش )و پلاری مزری خۆی دەگرێتە ئەو شتانەی کە بەلایەوە ناڕەوان .

دەتوانم بڵێم ئەو پلارانە ئەمانە دەگرێتەوە: (ئادە میزادی ڕووکەشی ئەمڕۆو خواستو ئارەزووە پوچەڵەکانی، ژیانی پڕ مەینەتی شارو شارستانیەتی ئاڵۆز ، ئەریتو یاسای کۆمەڵایەتی ) . شوکردنی ( چیمەن ) لەنەریتی بۆگەنی کۆمەڵایەتی جیا ناکرێتەوە کە هەر ئەوەشبووە هۆی ئەم کۆچو دمردەسەرییە .

ئەو ڕقەش کە بەرانبەر ئادەمیزادو شارو شارستانیەتی هەیە بە درێژایی گەشتەکە چی بەهەڵسو کەوتیو چی بەشەپۆلیهۆشی ( تداعی ) یەکانی بۆمان ڕوون‌دەبێتەوە .

دەست بەو گەشتە دەکاتو لەشار دووردەکەوێتەوە لەگەڵ ئەوەی ( سەر تۆپی منارەی مزگەوتەکان بزربوون ) بەڵام هێشتا ئەم ( تیژتر هەنگاوی‌نا .. لەزاقو زیقی شار بە دووركەوتەوە ) ( هەستی فرین لێی بە ئاگاهات ) دەیەوێ ساتێ زووتر لەشار ڕزگاریبێ بۆیە بیر لەوە دەکاتەوە ، گوایە دەشێ پیاو باڵی لێبڕسکێ .. بفرێ .. ؟ ! دیارە وەڕسبوونی لەشار گەیشتۆتە ڕادەیەك بەو هەنگاوانەی خۆشی قایلنییە بەڵکو وا تەنگەتاوبووە دەیەوێ هەر چۆنێ بێ چاوی لە چاوی شار ببێتەوە ، بەڵام گوایە دەشێ مرۆڤ باڵی بڕسکێ .. ؟ ! ڕەنگە پرسیارێکی وجودیبێ بەڵام گەربێتەسەر ڕاستیش ئەگونجاوە چونکە ئەنجامەکەی لە ئێستاوە ئاشکرایە ..بۆچ مەگەر مرۆڤی ئەمڕۆ ئەوەندە شیاوی ئەوەیە .. ‼ ئەی مەگەر ئەوانە هەڵسو کەوتەکانی ئین ( بەو بێ باڵییەش ) .. ‼ ئەگەر باڵداربێ دەبێ مەگەر خوا خۆی بزانی چیلی دەوەشێتەوە هەرخۆشی وەڵامی ئەو دڵە ڕاوکییەیی خوی دەداتەوە : ( ئاشێ هەر خۆشی چونکە سەری بەکونو پەناو پێچی شار دائەگرتو .. ڕۆژێ چەند باڵندە مرۆڤێ یا مرۆڤی باڵندە بەیەکا ئەکەوتن لەسەر تاقو پەنجەرەو بانیحەمامی ژنان باڵیان ئەشکا .. ئاخ مرۆڤ .. ! ( فرینەکەشی ئاسایی نابێت .. !

( ئاخ مروڤ ) ڕقێکی بەتینە لە قوڵاییەوە دەردەپەڕێ .. مرۆڤی ئەمڕۆ بەلای نوسەرەوە ئەوانەن کە پەنجەکانیان لەتامی توتن وبۆنی سفلس ئەگەڕین شاریش کە مەڵبەندی ئەو جۆرە کەسانە بێ دیارە ژانەسەرەیە ( شاریش سەگ ڕاوانەنێ ) نەك هەر مرۆڤ ـ لێرەدا دەیەوێ بڵێ شار هەموو شتێ ڕاوئەنێ تەنانەت سەگیش ، بەڵام بەو جۆرەی ئەو مانایەکیتر دەبەخشێو هەڵەیەکی زمانی تێدایە دەچێتە سەر هەڵە زمانەوانییەکانی تری دەبوایە بیوتایە : (شار سەگیش ڕاوئەنێ ) ـ .

ڕقەکان زۆر ڕەقن .. کە هەڵات وبیتی ( لەهاشو ورشی ماشینەکان ڕزگاریبێ ) تەنانەت ئامرازی خزمەت گوزاری وهاتوچۆ .. کەرەسەو ئامێری بەرهەمهێنانی شاریش لێی بونەتە دوژمنو جوان نایانینێ ... ڕۆیشت .. لەشار دووركەوتەوە ( هەستیکرد لە زەلکاوی خوێنو لیك نیوەخنکاوە و ڕزگاری بووە ).. تەواو ڕزگاری نەبووە .. ماویەتی .. تا هەنگاو بنێو دوور بڕوا بەرەو کۆشی ئەو دەشتە ئنجا بۆنی جیهانی

ڕاستەقینە دەمژێ.. چونکەدووره : لە مرۆڤ لە ئاوەدانی .. نا هێشتا نەگەیشتۆتە ئەو سنووره .. چونکە ئەوەتا ( دارتەلەفۆن ) بەدی دەکرێ دیاره دەستی ئاوەدانیو مرۆڤو شارستانیت گەیشتۆتە ئێرەش بۆیە مایەی خەمو سەریەشەیە ( دار تەلەفۆنەکان سێ لۆچی باریکیان بەڕاندە نێو چاوانی .. گرژبوو .. مووی سەری گڤ وەستا .. ) .

ئەو دیمەنە ئالۆزانە هێلی سەرەکی شارستانیەت بوون(جگەرەو توتن ، خواردنەوە ، ڕابواردن ، سێکسو سفلس ، درۆو دەلەسە ، غەلوغەش ناڕاستی ... هتد ) ئەم بەوانە قایل نەبوو .. ئەگەڕا ئەگەڕا بە دوای ( شتە وردو بزرەکانا) گوایە دەگاتە ئەنجام یاهەر نەبێ بە دیمەنێك، بارێك ، هەلوێستێك دلی ئاوی پێبخواتەوەو پێی ڕازی بێ کە ئەنجامە .. دیارە دەگا .. بەلێ یەکێ لە زبلخانە گەورەکانی دەرەوەی سنوری شار ( هەر ئەو زبلخانەی کە شتومەکە کۆنەکانی تێدا بەدی کرد ) بوون بە دوا مەلبەندیو تێیدا کرۆشکەی کرد ، دیارە ئەمەیە ئەنجام .. هەر بۆیەش لە دەفتەری تێبینەکانیدا نوسی : ( زبلخانە ئەنجامەو ڕشانەوەی هۆیە ) ..

دیاردەیەکی دیالیکتیکیە ، هەر هۆیەك ئەنجامێکی هەیەو هەموو ئەنجامێك هۆی هەیە کەئەو ئەنجامەش ڕشانەوەیە .. زادەی گۆڕانە .. گەر لەو کلاوڕۆژنەوە تێی بڕوانین دەبێ ئەم ( زبلخانە )یە وەکو ( ئەنجام ) ێك ( ڕشانەوە )ی چی هۆیەك بێت .. ؟ ! نوسەر بەئاشکرا ولامی نەداوەتەوە بەلام پوختی چیرۆکەکە ئەوەمان پێدەلێ کە : ـ ( زبلخانە ئەنجامی شارستانیەتە ) .

ئەگەر ئەم تێبینیە ( کە یەکێکە لە سێ تێبینی لە دەفتەرەکەیدا نوسیبووی ئەو مانایە بەخشیو بە ئاسانی مەبەستەکەیمان بۆ ڕوونبووەوە ئەوا دوا تێبینیی ( کە دوا دێڕی چیرۆکەکەشە ) مەتەلێکەو مەگەر نوسەر خۆی هەلیبێنێ : ( ئیمرۆ چیمەن ئەدرێ بەشوو .. بۆشم دەرکەوت لەسەگ ئەترسێم کە چی ئەویش لێم ئەترسێ .. ) .

شوکردنی ( چیمەن ی دەزگیرانیمان زانی ، بەلام ئەو ترسە دوفاقیە لەگەل سەگا جێی سەرسوڕمانە .. گوایە دەبێ کارا گرێیەکی تری سایکۆلۆژی هەبێت بەرانبەر بەسەگو ڕوداو و بیرەوەرییەکی ترسناکی ڕۆژگاری مندالی لەگەلا هەبێتو جار جارە دێتەوە یادیو بەو وڕێنانە خۆی دەنوێنێ .. ؟ ! یا نوسەر تەنها ویستویەتی چیرۆکەکەی هەروا ئاسایانە کۆتایی نەیەت بەلکو بەو دێرە سەیرو سەمەرە شتێکی نوێو ئەنتیکەو سەرنج ڕاکێش بخاتەپێش چاومانو ماناو مەبەستیش هەرچی بدات بەدەستەوە گرنگ نەیێت ..؟!

★ ★ ★

( شێرزاد حسن ) یەکێکە لەو چیرۆکنوسانەی کە بەرهەمیان کەمە ( یا باشتر بلێن بەرهەمی کەم بلاودەکرێتەوە یا دەکاتەوە)و دەتوانم بلێم لە چیرۆکی ( ڕەشۆلە )ەوە (٣) تەکنیکی نوێی هونەری چیرۆك بەکاردەهێنێو ڕێگاو شێوازێکی تایبەتی گرتۆتە بەرو زۆرتر لایەنی سایکۆلۆژی ( دەرونی ) و هاندەرە سێکسیەکانی مرۆڤ دەگرێو بەووردی لێیان دەڕوانێ ، ولەم چیرۆکەش بەتایبەت ئەو تەکنیکە بەهێزی بەکارهێناوەو شەپۆلی هۆشو فلاش باکەکان لەشوێنی خۆیاندا بە شێوەیەکی ڕاست هەلی بژاردوون ( کەلێرەدا ئەمویستووە لە سەر ئەوانە بدوێم ) بەلکو زۆرتر ناوەڕۆکو لایەنە شاراوەکانی چیرۆکەکەم دەرخستووە و تاچی ڕادەیەك سەرکەوتووە ..

بە هەرحال فۆرمەکەشی لایەنی بەهێزی وەرگرتووەو خۆی بەسەر ناوەڕۆکا سەپاندوە بەوەش مەرجی یەکێتیی ناوەڕۆکو فۆرم لەکیس داوە ( کە ئەدبوایە وابێ )و دەتوانم بلێم پارچە پەخشانێکی ڕەسەنەو بە زمانێکی پەتیو ڕەاوان داڕێژراوە . تەنانەت ئەو وێنانەی کە دەری بڕیون ئەوەندەی‌تر ڕوخسارەکەی زالترکردووە .

وەکو بۆشمان دەرکەوت گەرانی قارەمانەکە بەمەبەستی گەشتو سەیران نەبوو بۆیە ناونیشانی چیرۆکەکەم بەلاوە گونجاو نییە . چونکە بەو شێوەیە لەهۆکان دایدەبڕێو دەیخاتە قالبێکی ئەبستراکتیزمەوە .

ئومێدی پاشەڕۆژێکی گەشترو بەرهەمی باشتر لە چیرۆکنوس دەکەین بەتایبەت کە تاڕادەیەك شارەزای زمانو ئەدەبیاتی بێگانەیە و دەتوانێ سوود لەو تاقیکردنەوانە وەرگرێ .. هیوادارم ئەم نوسینەش ببێتە هاندەرێك بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە نەك بە پێچەوانەی ..


**پەراوێزەکان**

(١) گۆڤاری بەیان ژمارە (٤٩) ١٩٧٨ ل ٣٦ـ٣٧

(٢) گۆڤاری بەیان ژ (٤٦) ١٩٧٨

(٣) بەیان ژ (٤٢) ١٩٧٧ ل ٣٤ـ٣٦



# چلـێـك بـەفـر!

حسین بەفرین

بڕیار وابوو ،
کەهاوڕێم بیت
ئەم ڕێ سەختەم لەگەڵ ببڕی
بڕیار وابوو ،
ئامێزێك بیت
کاتێ مردم
کاسەی سەرم ، باوەش بگری
بڕیار وابوو ،
دەسکەنەی قژی شەوکەیت
لە تەلا مەرگا بی پروێنی
کە چی ئیستا ،
بە دوی خۆتا سێبەرەکەت
ئەپێچیڕەوە
کە چی ئیستا
بۆ کەمێ سەر خەوی لاڕێ
دەست لە دنیا
ئە کێشی یەوە
وەك باڵدارێکی سەرمەڕۆ
ئەم لا ئەکەی ، ئەو لائەکەی
جیگا نیڕە بت گرێتەخۆ
گیانە خۆمن ،
خەزان نەبووم
گوڵی عومرت هەڵوەرێنم
گیانە خۆمن ،
گریان نەبووم
پێڵوی چاوت بخنکێنم
وەك مرۆڤێك ،
وێلم بەدوی ڕوبارێکا
لیخن ئەبێ
شەیدام بەشوێن بەهارێکا
چلکن ئەبێ
بەلام گیانە !
گەر تۆش نەبیت
هەژارەکان
سەری کاسم باوەش ئەگرن
بەو چاوانە !
گەر تۆش نەبیت
چەوساوەکان
ئەم ڕێ سەختەم لەگەڵ ئەبڕن
فێرم ئەکەن
چۆن دەس لەمل هەوراز بکەم
فێرم ئەکەن
چۆن وەك ڕوبار
نە سرەوم
بۆ لیشکی خۆر سنگم ڕاخەم

# تیشکەکانی جوانی لە ـ زریان ـ دا

ئومێد ئاشنا

**( هەرچی جوانی هەیە لە جیهاندا ئەگەر تەنها ڕۆژێك پێش مردنم بمرێ ئەو کاتە ئەتوانم شیعرێك بنوسم باسی پێکەنین بکات )(١)** پێکەنین لەم واتایەی ـ حسین مردان ـ دا ئەگەر بێت و بە پێچەوانەی گریانەوە تەماشا بکرێ و پێوانەی بۆ دانرێ بە بێ وریایی و تێگەیشتن لە مانا فەلسەفی و مەنتیقیەکەی گریان و پێکەنین و تێ ڕامان لە جوانی و ناوەڕۆکی جوانی ئەوا لە ڕوە هونەریەکانەوە ناتوانین لەو خەمە بکەین کە جوانی چ وەك خورپەیەك یاخود وەك لێکدانەوەیەکی مرۆڤانە لە ویژدان و هەستی کەسیادا دروستی ئەکات . جوانی لە پێوانە کردن و ژمارە بۆ دانانیدا سنووری نییە . هەموو شت بە پێی ئەو ڕواڵەت و ناوەڕۆکانەی تیایدا هەیە جوانی خۆی موگەر ئەکان ئیتر دانانی پلەو چۆلیەنی نرخی جوانی لە ڕوانینی مرۆڤەوە دێنە دی لە مەزاج و هەڵکەوتنی باری نەفسی ئەوەوە دروست ئەبێ، ئەو هەمەشدا کە جوانی وەك ڕواڵەت و ناوەڕۆکیش ئەبەخشێ لە مرۆڤێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازی هەیەو ئەگۆڕێ .

جوانی بە پێی زۆربەی لێکدانەوە فەلسەفی و ئەدەبیەکان لە کاری هونەری و هونەرکاریدا دەرئەکەون ، جوانی لای بۆ دلێرو کروتشە بەو جۆرە تەماشا ئەکرێت. هۆمیروس یەکەمجار لە شیعردا وشەی جوانی بەکارهێناوەو بە دوو لایەنەوە بۆی چووە . لایەنی یەکەم لەو شتە واقیعیانەدا کە هەستیان پێ ئەکەین و لە ڕێی حەواسەوە نرخ و چۆنیەتیان دانەنرێت . دووەم بریتیە لەبەهر ، یەکی چەدایف لەلایەنی دوەمدا هومیروس تەواو ئەچیتە بەرەی لێکدانەوەیەکی ئایدیالیستیانەوە بۆجوانی چونکە فەلسەفەی ئایدیالیستی جوانی بێ سنوور ئەوپەڕی کەمال و گەورەیی لە زاتێکدا ئەبینێ کە زاتی خودایەو مرۆڤ ئەو خۆشەویستی و جوانییە لە دڵیدا هەڵئەگرێ و ئەیپارێزێت ، ئەمە کەمنز بەلای مێشکدا ئەچێت وانە ئەبێ بەکارێکی ڕۆحی و لە عەقڵ دوور ئەکەوێتەوە ـ کرۆتشیە کە دەستێکی باڵای هەبوە لە زانستی جوان ناسی و بە خاوەنی ڕێبازێکی تایبەتی خۆی دائەنرێت لە ئیستاتیکداو فەلسەفەکەی ڕۆحییە ئەڵێت ـ جوانی ـ جوانی تەعبیرەو لە کاری هونەریدایە ـ لەم لایەنەوە ئەگەر بلێین جوانی تەعبیرە لە ڕواڵەت و ناوەڕۆکی باری کۆمەڵایەتی و واقیعی ژیان و هەستکردنی کەسانی کۆمەڵ و ئەنجامی ماسە لە کردنە لەگەڵ سروشتداو ئەمانە هەمووی لە کاری هونەریدا دێنە دی و بە ڕێك وپێکی ـ متناسق ـ ئەوەستن ئەوا لایەنی ڕۆحیی لە جوانیداو هەڵسەنگاندنی بیری مادیی بۆ جوانی لە یەك جێگەدا تێکەڵ بەیەك نەبن . ئەمە ڕای منە سەبارەت بە جوانی کە بە نێخدانی دوو هێڵ و ناوێتە بوونیان جوانی ئەگاتە ئەو جێگەیەی بتوانم ئەشوەیەکی ڕۆحی و دلنیایی لێکدانەوەی خۆمی تیادا ببینم . ( ئاتەواوی سەرەکی زانستی جوان ناسی پێش مارکسیەت ئەوەدابوو کە بەدوای چالاکیە ئاسی جوان ناسیدا ئەگەڕا دوور لە چالاکییە کۆمەڵایەتیەکانی تر ) (٢) ئەو چالاکییە کۆمەڵایەتیانە لای هەندێ کەس وەها ئەبینرێ کە ناتوانرێ لە هونەردا بەتایبەتی وێنەکێشان و شیعردا ببەسترێتەوە بە بایەخ‌ترین ڕودکاسی جوان ناسیەوە . ئەوانە یاخود تەنها لایەنی ڕۆحی ئیستیتیك وەرئەگرن یا وەکو بڕوایان بە ڕواڵەت و ناوەڕۆکی جوانی نییە لە فەلسەفەی ماتریالیوا . لە شیعری ئەئومردا ڕوی ستاتیك لە دوولایەنەوە دەرئەکەوێ : یەکەم : لایەنی جوانی تەنها وەك وێنەی شیعری و ڕازاندنەوەی‌وشە لەبەکارهێنانیداو تەعبیری جوان لە شتی جوان . دوەمیش: لایەنی بەستنەوەی فۆڕمی جوانی بە ناوەڕۆکی جوانی و گۆڕان و چۆنیەتی باری کۆمەڵایەتیەوە . کە بە پێی ئەمە ئەو تێگەیشتنەی شاعیر لە ڕوی ئەتەوەیی پێشکەوتن خوازانەوە وەك دیاردەو بنچینەیەك دەرئەکەوێ .

ڕوی یەکەم : ـ

**دوێنێ تۆم دی لە ئاسمانا**

**هەموو شینایی سامالت کردبوو به**
**ڕەفنه بو سەرت**
**نۆینی توم دی له ئاوێنەی شەپۆلێکا**
**دلێ ئاسوت کردبوه گوڵ**
**دابوت لەیەخمو کەمەرت**

ڕوی دوەم : ــ

**لەی خواکەی غەریبان تۆ**
**له کاکەی هەوری ئالەوه به پێی**
**پەتی**
**کەی دلێینو کەی تو پەیامێ بۆمە**
**دینو**
**کەی به هەموو جیهان ئەلێی**
**ئا ئەمەنه جگەرکوشەی بێ ناز**
**کەوتوی زەوی منن )**
**ـ وێنەکانم گۆرانیەکەی پۆل**
**ڕۆبسن ــ ن**
**هەنگاوی دەنگ‌بەسەر هەموو**
**ستوریکی**
**دوورا ئەنێن**
**له جەنگەلی گیانی شەوا گولی**
**پشکونو ئه سوتێن ) .**

لای زۆربەی شاعیرەکانمان به هۆی تێ نەگەیشتیانەوه له ڕاستەقینەی کاری جوان ناسی لەبەك ڕودوه ئەو مەبەسته بەکەرهاتوه . سۆزێکی گەرم ـ هەلچونێکی کانیی به هۆی جوانیەکی ڕوالەتیەوه شیعری پێ وتون . گەلێ جار شیعرەکه کەوتۆته ژێر کاری گەری ئەو سۆزەوه . ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو جوانی‌یە ڕوالەتی‌یەی سۆزێکی دەروونی پێ‌بەخشیوەو بوه به ساتێکی شیعری‌و ئەمه شتێکی ئاسایی‌و چاوەڕوان کراونەبووه ، چونکه وەك ئاشکرایه هەمیشه شته چاوەڕوان کراوو کوتوپڕەکان‌و بینینی ئەوپەڕی خەم یاخود جوانی تیایاندا لای شاعیر ئەبنه گەورەیی‌و مەزنی‌و هانا بۆ بردنیان بۆ ئەو ڕوالەتانەی کراو نەبووه ، ونکه وەك ئاشکرایه هەمیشه شته چاوەڕوان کراوو کوتوپڕەکان‌و بینینی ئەوپەڕی خەم یاخود جوانی تیاندا لای شاعیر ئەبنه گەورەیی‌و مەزنی‌و هانا بۆ بردنیان بۆ ئەو ڕوالەتانەی شیعرەکەی پێ ئەلێن . بینین‌و هەست کردن به جوانی لای ئەتوەر جیاوازەو له سنووری خورپەیەکی ناوەخت‌و ساتێکی شیعری تێ ئەپەڕێ‌و به ناوەڕۆکی ژیان‌و دیاردەکانی جوانی‌و خۆشەویستیدا ڕۆنه چێ [ خاکی کوردستان ــ گۆرانیەکانی پۆل ڕۆبسن ــ گۆلاوەشینەکەی دەربەنەـ به خورِ ڕێژنەی سەوزی نوری خوا] جێگەی مەتیقی‌و دیاری کراوی خۆیان هەیه که هەست ناکرێ وێنەیەکی شیعری‌و تەعبیرێکی فۆتۆگرافی له جێگەی موناسبی خۆیدا نەبێت . ئێمه ئەگەر لەو زەمینەیە پێ داگرین که شیعری فۆتۆگرافی‌و ڕۆمانتیکیانەی نوێی کوردی یێوە هەلچوبێ هەر چۆن بێت ئەبێت له ـ گۆرانەوه دەست پێ‌بکەین . وه لەمەشدا ئەتوانین بلێین لەسەرەتاوه که گۆران بڕوای ئەواوی ڕێبازی هونەر بۆ هونەر هەبووه ئەو وێنەو دیمەنه جوانانه لای ئەو تەنها ڕوالەت‌و دیوی دەرەوەیان توانیوبەتی عاتیفەو هەستی جوان پەرستی گۆران ــ دا چرۆیان کردوەو گولیان گرتوه . توانیویانه گری خەمێکی قورس‌و ماتی‌و خامۆشیەکی کپ‌و سوتێنه له دەرونیا هەلگیرسێنن به مەش ئەوەی له توانای سەلیقەو دەرفەتی دەربڕنیا بووبێ به شیعری جوان تەعبیری لێ کردوه . شیعرەکانی ــ بەهەشت‌و یادگار ــ فرمێسك‌و هونەر ــ دوو هاوینه گەشت ــ سروشت‌و دەرون ــ نمونەی ڕاستی ڕبازەکانمانن ، له پاش ئەمیشەوه لەسەر هەمان ڕێباز جەمال شاربازێڕی بەرهەمی شیعری گۆران تەنانەت لەو وێنه فۆتۆگرافی‌و وێته شیعریانەدا که باس له جوانی‌و خۆشەویستی ئەکات‌و سەرەتای شیعرووتنی بووه له نوێ کردنەوەکەیدا دوو وەستاون له هەر هەست‌و بۆچونێکی مرۆڤانه . نەء ــ بەلکو له هەندێکیشیاندا جوانی ئافرەت بەتایبەتی تێکەل به ڕوداوەکانی کۆمەل ئەبێت . ئەو کارەساتانەی که ئەنجامی ڕژێمی دەرەبەگی‌و دەسەلاتی‌ئەو رژێمه له کۆمەلدا ئەیهینانەدی . له بوکێکی ناکام‌و نۆبەرێتنی ئەنجامی یاران و بەردە نوسێك ــ و هەندێکی تریشدا ڕاستی ئەمه دیاره لەلام لەو سەردەمەدا جوانیەکان لای گۆران به دیوی دەرەوەیانەوه بەسترابوون، خەمی گۆران ــ پێش که له جوانیدا پێلا ئەهات جیاوازی نێوان جوانی‌و جێگەی جوانیەکه بوو ــ ئافرەتێکی جوان له یارێکی ئابووری تزودا ــ ئافره تێکی جوان لەگەل هاوسەرێکی به تەمەن یاخود پیاوێکی زۆردار یا ڕێکەوتی ئەو ئافرەته له کات‌و جێگەیەکدا که شایەنی جوانی ئەو ئەبێت‌و لای گۆران جوانی‌یەو گەورەیی‌و له جێگایەکی وا پچوك‌و نزمیشدا دانرابێ‌و وەها مامەلەی لەگەل بکرێ ئەوا ئەمه تەواو سەرچاوەی خەمه . گۆران زیاتر پێشکەوت له سالانی دوایی شیعر نوسینیدا له ڕوی بابەتی جوان ناسیەوەو وەك له ــ مۆسکۆی جوان ــ و ــ وەلامی پرسته و بێداربەك‌و ڕێگای لینین‌و هەندێکی تریشدا . لێرەدا که باس له گۆران‌و ڕوانینی ئیستاتیکی ئەو ئەکەین مەبەستمان دۆزینەوەی

جیاوازی ئەو هەڵسەنگاندن و نرخاندنەی جوانی‌یە لای دوو شاعیری داهێنەر و جوان ناس و عاشق ـ واتە گۆران و ئەتومر ـ چونکە دەربڕین و مامەڵە کردنەکەیان تەواوجیاوازەو هەر یەك وەستایەتی و سەلیقەی خۆی لەم بارەیەوە بەکارهێناوەو جیگای خۆیان دیاری کردوە . وەك وتم لە زۆربەی بەرهەمی سەرەتای تازە کردنەوە شیعریەکەی گۆران ـ دا کاری‌گەری جوانیە کە ڕوالەتی‌ی بووە بەڵام لای ئەتومر هەر لە سەرەتاوە بە پێی جیاوازی ئەو فەترە زەمەنی‌یە بۆجەوهەری جوانی‌یە کە چووەو بە منالانی کوردستان و گۆرانی مرا بیوست و خواکەی تەربیانەوە توند گرێ‌ی‌داوە ـ لەم شیعرانەی گۆران ـ دا بەراوەردەکە ئەدۆزینەوە لە دوورو نزیکی بۆ هەستی جواسی ئەو ئەتومر ـ دا .

— بۆ نایەنم ئەگەڵی‌ێ
هەندێ کەس
با حار بدرێ
تویت‌و بەس
قیبلەی ئاین‌و باوەڕم
خوانی بەهەشتی دلی تەرم ـ

— لە لەعنەت بسێ لاوەری
جوانی سروشتی
دا ئەلیقێ هەر دلی کەوتە
مشتی ـ

لە پاشی لێبەرینی سنوری هونەر بۆ هونەرو بەر فراوانی‌دنیای جوانی‌ی‌و مرۆڤایەتی‌ی‌و خۆشەویستیەك کە خەلکی تریش بگریتەوە شیعری ستالیکی لای شاعیر ئەبێت بە : ـ

— چەختیری نیشتمان چە
ئارەقی ڕەنج
کوردستان سەرانسەر پڕ ئەکا
لە گەنج
باخچەمان سەرانسەر گولی
ئەپشکوێ
بلبلمان هێز ئەبێ بە ئاوازەی
نوێ
تەنانەت لە پێشکەی ساوامان
گریان
ون ئەکا موعجزەی بەختیاری
ژیان ! ـ )(٤)

ـ دروستبونی هەستی جوان

بەرستی لای مرۆڤ کارسازاندنێکی درێژ خایان‌و تێك‌چراوە کە لە پێشکەوتنی هونەر خۆی جوێ نابێتەوە (٥) ڕادەی گرنگی تەعبیر لێ‌کردنی هونەریمان بۆدەر ئەکەوێ لە هەر ڕوالەت‌و ناوەڕۆکێکی جوانی کە بیخاتە هەڵسەنگاندن‌و بەرتیشکی هەستی لێکدانەوەی جوان ناسی خۆیەوە . لێرەدا ئەپرسین جوانی چی‌یە ؟ وە ئایا شتی جوان چون ئەچێتە کاری هونەری جوانەوە من‌لای خومەوە پێ ناسەیەك نادۆزمەوە بۆ جوانی بەکاربێت‌و بکرێتە دەستورێکی دانراوو قیاسێکی نەگۆڕاو وە هەمیشە بۆ نرخاندنی ڕادەی هەموو جوانیەکان بەکاربێت . بەلکوبەلای منەوە دۆزینەوەی پێ‌ناسە بۆ جوانی کارێکی نەشیاوە لەبەر ئەوەی جوانی خۆش سنووری نی‌یەو پڕە لە نهێنی وەها کە مرۆڤ تەنها تروسکەیەکی لێ ئەبینێ‌و جۆرە سیحرێکی سەر سوڕهێنەری تیادایەو مرۆڤ کەیل‌و مەست ئەکات ئەیخاتە حاڵی سەیرەوە بە شێوەیەکی هاوشان چەندە مرۆڤ خاوێن بێت ئەوەندە زیاتر هۆگری جوانی ئەبێت‌و تیایدا ئەتوێتەوە . مەبەستم لە خاوێنی مرۆڤ هەستی مرۆڤانەو پێوانەی مرۆڤانەو ئەوە . چونکە کاتێ مرۆڤ لەو هەستە دائەبزێ‌و کاری نامرۆڤانە ئەنجام ئەدات گولێکی جوانی کەشاوە ـ تابلۆیەکی پڕ لە تەعبیر و بیری وردو ڕەنگی گەش‌و تاریك ـ

پرشنگی چاوو جوانیەکانی ئافرەت ـ شینایی ئاسمان‌و ئەستێرە لای ئەو هیچ بایەخێکی نابێ‌و تەنانەت کاتی‌کردنی جوانی ئافرەت‌و نهێنی جوانیە ڕوالەتی‌و توانای سیحری سەر سام کردنی مرۆڤی جوان ناس لای ئەو توڕەهاتەو هەرگیز بیری لێ‌ناکاتەوە. هەر لەوەش ئاگادار نی‌یە کە مرۆڤی گەورەچۆن لە بە رامبەر سیحری جوانیدا تەسلیم ئەبێ‌و هەموو گەورەیی خۆی‌و هەستی جوان ناسی‌و لێکدانەوەکانی لە هەر ساتێکدا بن لە خەندەیەکی خاوێنی فریشتانەی سەر دوو لێوی جوان‌دا ئەتوێنەوەو ئەبن بە شتێکی پیرۆز . بەڵام لە هەمان کاتدا لەگەڵ هەموو ئەو تەسلیم بوون‌و هانا بۆ بردنەدا هەر ئەو خاوەن ئحساسە ناسکە هەلوێستێکی مرۆڤانە ترو قولتر وەرئەگرێ‌و بە دیوی دەرەوەی جوانیەکە سڕ نابێت‌و ئەیەوی یاخی ببێت . ـ [ ئەزانم تۆ وەك منالێك تەماشام ئەکەی کە هەندێ جار پێویستیە یاری بکا ت‌وە دلنیای ئێواران ئەگەڕێنەوە بەڵام خانمەکەم بە داخەوەم کەمن هەتا هەتایە ناگەڕێمەوە ئەوپەڕی گەمژەیی‌یە پیاوێك بەردەوام بێ لە خۆشەویستی ئافرەتێکدا کە ئەتوانێ خۆی بەجێ‌بێلێ ] (٦) شتی جوان ئەگەر ئەچێتە کاری‌هونەری جوانەوەو تەمبیری لێ ئەکرێ ئەوا لە ناخی مرۆڤدا لە توێی هەستی

مرۆڤانەی ئەودا جێگیرەو ئەزانێ چەندە لێوەی دورە یاخود نزیکە سروشتو تاقیکردنەوەی مرۆڤ لە کردنیدا لەگەڵیدا لە هەر سەردەمێکدا بووبێ توانیویەتی سەرنجی مرۆڤ ڕابکێشێ بەلای شتە جوانەکانداو بیری ڕوانینێکی وەهای بداتێ کە بتوانێ لە شتە ناشیرینو خراپەکانیش بکات .

لە شیعری ئەنوەردا ئەم دیاردەیە لە تێکەڵی ئەو و خۆشەویستی خاکەکەیو مرۆڤەکانی دنیاوە دێتە پێشەوە بیرکردنەوەکان لە جوانی گەورە ترو گەورەتر ئەبن :

**( جار جار کەژێ دەمی تینوی**
**بۆ ڕومەتی ڕوبار ئەباو هەر پێی ناگا**
**دوایی ئاوڕ لە کانیاوی دیلەر**
**سینەی خۆی ئەداتەوە**
**کانیاوەکان کیژۆلەی سرتو بزێون**
**پێئەکەنن ـ لە ژێردەستی**
**ڕائەپسکێن ـ ئەلێن ئێمە**
**دلۆپ ـ ئەبین بە شیرینیی ڕوبار )**

نموونەی تێکەڵی شتە جوانەکان یەکاریهونەری جوانو هەست بزوێن لەو شیعرەی سەرەوەدا دەرئەکەوێ ـ کەژو ڕوبار سەرچاوەو کانیاو ـ کانیاوە سرتو بزێوەکان ـ لە دەلالەتی وشەی ئەتومردا قوڵی ماناو بەر فراوانی هەستێکی شاعیرانە پێك دێت ـ تەنها تەعبیر لێ کردنی ئەم لە جوانی گوێزانەوەی ڕەنگو مادەی سروشتو مرۆڤ نی یە بۆ تابلۆکی شیعری بەلکو لە ئامادەکردنی بیری گوێزاتەوەو داڕشتنەوەی ڕوە جوانەکانی لە قالبلی هونەری بەرزداو بەستنەوەی جەمەرەکانی ئەو هونەر کاریە بە بیری مرۆڤانەو ڕوانین لە ژیان بەچاوی هیواو گەش بینیەکی نورەوە ، ئایا هەموو کارێك

کە مرۆڤ بەرانبەری سەری سوڕ بمێنێو حەزی لێ بکات هونەرو هونەری جوان کاری تیادایە ؟ بەلای منەو ئەمە وەها نی یە چونکە ئێستاتیك بنج بەستە بە مرۆڤەوە ـ بە بزواندنی شتە مادیەکانو سەراپای سروشتەوە وە هەر کانیش مرۆڤ بو هەستێکی سادەو ساتێکی خابەنی ئارەزووەکانی خۆی پەنجەی لەسەر جوانیەکان داناو لە پشت هەر جوانیەکەوە ئازاری مرۆڤ ڕادەی سەربەستیو کەمرو زۆری موعاناتی، هونەر مەتدرو جوانیەکانیش وەك شتی جوان مەدی ئەوا پێوانەی ئەو بۆجوانیەکان لە هەقیقەتی جوانیەکان دوورەو تەنها توێکڵو دیوی دەرەوەی ئەبینێ و بەلاڕێدا ئەڕواو لە کەنارەوە ڕوانێت .

جوانی سیفەتی هەمووشتە ـ هەموو شت ئەوەندەی ماهیەتی خۆی جوانیی تێدایە . ئیتر شێوەو هەلکەوتنی جوانی ئەو شتە مەرج نی یە لەو جوانیانە بێت کە لە کۆنای ئاڵی ئافرەتێكو ئەخشی بەرەی گوڵێکدا هەیە ، بەلکو جوانی تەنانەت لە گریانو پێکەنینی مرۆڤیشدا دێتە دی . زۆر جار جوانیەکان ئەگەنە ڕادەیەكو وەها گەورەو قورس ئەبن لەسەر شانی شاعیرو دلێ وەها لە چێکیاندا گیر ئەدەن پیالەکەی پڕ ئەبێو سەر ئەکاو لێوەی ئەڕژێ . کاتێکیش لەمە زیاتر ئەبێ هەناسەی توند ئەکاتو بواری لێ ئەتەنێت . بەرەو چەند مەیلو بۆ چونێکی ڕۆمانتیکیانەی ڕەشبینو بێ ورە ئەچێت . ژیانو کارەساتەکانی بە خەمو تەم ئەبینێ ـ پرسیار ئەکات ـ ڕا ئەمێنێ ـ سەرسام ئەبێ بەربەستی فرمێسکەکانی بۆ ناگرێو بەسەر

خۆیو هەوێنی کارەساتو منالو بە خوڕ ئەگری : ـ

**ـ بۆمان ئەبم**
**مالی ئاوای دلدارانی ئەم ولاتە هەر**
**ئاوایە**
**شادیش ئەبێ بە خەم هەموو دەم**
**ئاوایە**
**من خەمیشم چنگ ناکەوێ**
**تالەو بیکەمە پڕ پۆلەی پێچوە شیعرە**
**برسیەکانم ـ**

لێکدانەوەی ماتیو خەمی شاعیر تەنها بەو ڕوەدا ئەکەوێت کە تووشی بێ هیوایی ئەبێو ئەگەرچی بە دوای خەمێکیشدا ئەگەڕێت کە بیکاتە خۆراکی شیعرەکانی بەلام هەر نی یە ! بەو مەبەستەش ئەگەر بلێین خەم شورشە . خەم بیرو لێکدانەوەی بەجێو یاخی بونو هێشتا شاعیر هەر ئەچێتە بەرەی ورە بەردانو ڕەشبینی مەسەلەکەوە سیفەتی جوان ناسی لە بۆچونەکەی دا ئەبڕێو ئەم دەستەوستان دائەنیشێو شتێکی بێ ئەنجام نادرێ : ـ

**ـ شیعرەکانم چاویان هەموو**
**پڕ لە تەمە ـ خەمە ـ تەمە ـ**
**ـشێوەی ونی یارەکەمم**
**هێشتا بەخەویش ئەدیوە .**

کاتێ شاعیر کە ئەم شیعرانەی خۆی ەندو بنج بەستی قەزیەیەك بوو کە بیری ئەتەوایە لە لە دەمارەکانیا تینو تەوژمی خۆینی بوو ، بە پێچەوانەی گەلێ ڕوانینی شاعیرەوە لە زەمینەی خۆیدا هەل ئەچوو وەپەخشو بلاوئەبووەوە . ئەو نەك هەر یارەکەی خۆی سەدان جار دیوەو هەر لە سەرەتاوە دەست نیشانی کردوەو شێتو شەیدای ماچێکی بووە بەلکو خەرمانی شیعری بۆ هەلداوەتەوەو لەو ساتە ڕەش بینانەدا ئەبێ کەوەهای زانیوە

تەواو لێی بزر بووە ئیتر هەتا هەتایە لە جێ ژوانێکدا خۆی نابینێتەوە دەست بکاتەوە ملی‌و لێوی تیژ هەڵمژێ ئەوە لەیاد ئەکات کە هەر ئەو ئەم گۆرانیە پرسۆزو خۆشەویستی‌یەی بۆ وتوەو لە نامێزی گەرمی خەمەکانیا پەروەردەی کردوە : ـ

**ـ تۆ ئاگری ماڵە کوردێکی کۆچەر بووی**
**لە دوورەوە گەشت گەشت دیار بوی**
**ڕوم لە تۆ بوو هۆگرت بووم**
**هۆگری تۆم ـ چۆن هۆگری شەقەی باڵی**
**ئێوارانی مەلەکانم**
**هۆگری تۆم چۆن هۆگری**
**گۆرانی شەوانی شوانم ـ هۆگری تۆم ـ**

لێرەدا پەیوەندی نێوان تێ‌شکاتی عاتیفی شاعیرو بە ئاشکرا ڕەنگ‌دانوەی لە کۆچی شازادەداو هەموو ئاهە قوڵ‌و حەسرەتیەکانی تێکەڵ بە بارێکی ناهەمواری کۆمەڵایەتی‌و حەزە نەتەوەیەکانی شاعیر ئەبێت‌و جۆرێکی تر لە پەنجەرەیەکی ترەوە تەماشای جیهان‌و ڕوداوەکانی ئەکات . لە هەندی جێگادا بەرەو جۆرە ڕەش بینیەك ڕای ئەکشی‌و لە هەمان‌کاتدا ئەو حالەتی بەئس‌و ڕەش‌بینیە وەك دەربڕین‌و هونەرە تەکنیکیەکانی شیعر داهێنانی سەرکەو توی‌پێ ئەنجام ئەدەن : ـ ئەبێ دوریی زەوی‌و ئاسمان

**وەکو بەڵگە بۆ ئێوانی خۆم‌و شیرین بهێنمەوە**
**ئەبێ باسی ئاوارەیی شۆڕە سواری گوندەکەمان**
**بۆ جاری هەزارو یەکەم**
**بگێرمەوە ـ بیلێمەوە**

ئەوەی گومانی تێدانی‌یە ئەوەیە کە لایەنەکانی ستاتیك لە ڕێ ڕەوی ناسین جوانی ئافرەتەوە چەند تیشکێکن کوتوپڕ وەك بروسکە لە مرۆڤدا کاری‌گەری خۆیان ئەتوێنن . وە ئەمەش پەیوەندی بە هەڵکەوتنی دیوی دەرەوەی ئافرەتەکەوە هەیەو لەم شتانەدا کۆئەبێتەوە بالای ـ پێستی ـ ئەرم شلی‌و پتەوی لەشی ـ ئالی ڕومەت‌و بچوکی دەم‌و کولی‌لوت‌و گەردنی بە رنو چاوی گەش‌و پڕ لە بریسکە بریسکی تالە تیشکەکانی جوانی ـ قژی پەخش‌و خاو یاخود مۆدەی نوێ‌و بڕینی بە شێوەیەکی هونەری ـ سنگی بەرزو هەڵکەوتنی توندوڕەمی مەمك ـ قسەکردن‌و چاو ترووکاندن‌و خەندو شێوەی پێکەنین ـ جۆری ڕۆیشتن یاخود وەستان ـ دانیشتن‌و جۆری دانیشتنەکە ـ ڕوانین‌و ... هتد . واتە بوونی تەناسوبێکی تەواو لە دیوی دەرەوەو ئەندامەکانی لەشیدا . ئەم تەناسوبەکە بریتیە لە ـ الجزء ـ یەش وە سەراپا جوانن کۆئەبنەوەو هەموو ـ الکل ـ دروست ئەکەن بۆیە ناشێ چەند ـ جزء ـ یکی ناڕێك‌و ناشیرین ـ کل ـ یکی ڕێك‌و جوان پێك بهێنن . زۆر لە فەیلەسوفە جوان ناسەکان لەم بارەیەوە جوانی دیوی دەرەوەو ماهیەتی جوانیان ڕون کردۆتەوە وەك ئیفلاتون‌و ئەفلۆنین ئیفلاتۆنیەتی نوێ بەڵام لای ئیفلاتون جوانی ڕەوتێکر ـ سێ گۆشەیی وەرنەگرێ‌و تەمەنی ئەبەدی‌و هەمیشەیی نابێت . لەسەرەتادا دروست ئەبێ‌و گەشە ئەکات پەرەئەسێنێ‌و ئەگاتە دوا پلەی جوانی‌و بەرزی خۆی بەڵام لە پاشدا وەك گوڵ ئەژاکێ‌و نامێنێ‌و شوێنەوارێکی بەجێ‌نامێنێ لەو شێوە جوانەدا . بەڵام کاتێکش جوانی‌و خۆشەویستی لە یەکترا توێنەوەو ئەبنە یەك پارچە لەمەست‌و بیری شاعیردا وێنەی جۆر بەجۆر دروست ئەکەن‌و ئەویش لە رادەی هوشیاری‌و سەلیقەی خۆیدا ئەیکاتە شیعر ئەوتە ناسوبەی باسمان کرد لە ئەندامەکانی جوانیدا چ لە ئافرەتێکدا یان لە باخچەیەکدا لە ئاست ڕوانینی خۆشەویستیدا جیاوازی هەیە ئەشێ‌تێن‌و پرشنگی جوتێ چاو ـ بەڕەی گوڵێك سەرسامی بکاو هەموو بەشەکانی تری جوانی‌و خۆشەویستی تیادابیبنێ شێت‌و شەیدای ئەبێن‌و هۆگری بینین‌و هاوسەرێتی ئەبێ وەك بولبولێك بە دیار گوڵێ جوانیەکەوە ئەخوێنێ‌و هێلانەی خۆی دا ئەمەزرێنێ . واتە جوانیەکان ئەبنە خۆشەویستی ، ئەم خۆشەویستیەش پەرەئەستێنێ‌و لە سنوری شتە بچوکەکان تێ‌ئەپەڕێ‌و بابەت‌و مەسەلەی فراوان‌و گەورە ئەگرێتەوەو خەریکیان ئەبێ ـ لامارتین ـ ئەڵێت ئەزانم ئەوەی قسە ئەکاو ئەنالێنێ دڵە وە کاتێکش دەست ئەنووسێ ئەوا هەر دڵە کە ئەتوێتەوە (٧) بەم شێوەیە دڵ قەرمان ڕەوایەو دڵ نیشانەو جێگای عاتیقەو کانگای خوڕەو ئیلهامی خۆشەویستیە . هەر لە کۆنەوە ئەم ڕایە هەروا هاتوەو چەسپوە کە دڵ جیگای عاتیقەیەو سەر یا مێشك جێگای عەقڵە . لە هاوشانی کردنەوەی ئەو دوو دیاردەیەداو زاڵ ئەکردنی یەکێکیان بەسەر ئەوی تردا شیعری باش دروست ئەبێ ئێمە نالێین شیعر ئەبێ کارێکی عەقڵی بێت چونکە شیعر عاتیفەو ڕا چەنین‌و فرمێسك‌و پێکەنینە . دەلالەتی ئەو وشانەش هەریەك مانای ئەلسەفی خۆی هەیە .

سەرەرای ئەوەی کە ناوەرۆك خۆی هەر لەو عاتیفەو ڕاچەنینەدا نەبیتە بابەتو فیکری شیعرەکە . ئەنوەر لە کۆچی شازادەوە کە حەزو خۆشەویستی خۆی پێوە بەستبوەوەو ئەویش بوە ئەستێرەیەکی پرشنگدارو بە ئاسماندا هەلخزاو کشاو لەچاو ونبوو بەلام بیرەوەری‌و پارەکانی لای ئەو ماونەتەوەو بەردەوام کەم و زۆر دێنە شیعرەکانیەوە لایەنەکانی جوانی فەرامۆش ناکات‌و لەوبەری عاتیفەیەکی گەرمی شاعیرانەدا بیرکردن‌و بیرەوەریەکان هەلئەچن .

**ـ وەك مراوی سەرو بال سەوز**
**لە کەناری ڕوباری بیرەوەریتا**
**هەلئەنیشیت ، هەلئەرژیت ، بە**
**کول ئەگریت**

**ئەلێی جاران شاعیرێ بوو**
**دلێ رەق بوو ڕەقیش نەبوو**
**لەبەر گڕەی ساردی خەمیا**
**هەلئە چوەو سەمان ئەکرد**
**ئەلێی جاران شاعیرێ بوو**
**دلێ بەرد بو ، جۆگە لەش‌بوو !**

ئەنوەر ـ لە ڕوبەکی شاعیرانەوەجوانی دێنێتە شیعرەکانیەوەو مامەلەی لەگەل ئەکات . کە ئەلێم ڕوبەکی شاعیرانە واتە وەرگرتنی ئیحالە جوانیەوە لە بابەت‌و شێوەی دەرەوەی جوانیەکەو چونە ناو ناوەرۆك‌و بەستینەوەی بە جوانیەکانی تری دەرەوەی جوانی ئافرەت لە سروشت‌و جولانەوەی مرۆڤ‌و بیرکاری‌و لێکدانەوەی هۆو ئەنجامی ڕوداوو کارەساتەکان لە بچوك‌و گەورە ـ لە دورو نزیکیان ـ تا بەم شێوەیە جوانی ئەچەسپێ‌و نرخی تەواوی خۆی وەرئەگرێ . مامەلە کردنی ئەنوەر لە شیعرێکدا هەتا یەکێکی تر بە پێی پێشکەوتنی بیری شۆڕشگێری‌و پەیدا بوونی وەعیەکی تەواو تیایدا لەگەل دەستەی منالانی دێیەکەی کە نمونەی منالانی بێ بەشو دواکەوتوی کوردستانن گەلێ جەمسەری مەسەلەی گەورە سەبارەت بە خاك‌و خۆشەویستی دەستنیشان ئەکات . هۆنراوەکانی ـ زیندە خەوو تارمایەکان نوقلانەی خۆشەویستی‌و باران ـ وەرە خوارێ ئەی خوا کەی غەریبان ـ گولسورخی ـ نمونەی ڕوی پاك‌و بێ گەردی مامەلەی شاعیرە لەگەل منال‌و جیهانە خاوێنە بێ تاوانەکەیاندا

ـ ئەبێ باسی ئاوارەیی
شۆرەسواری گوندەکەمان
بۆ جاری هەزارو یەکەم
بکێرمەوە ـ

دوبارە بو نەوەی هەزارو یەکەمجاری گێرانەوەی بەسەرهاتی ئاوارەیی شۆڕە سواری دێیەکەیان بۆ منالان دیوی تاریکی بیری جوان ناسی شاعیرەو لە زورێکی تەسکی بێ سەرەوە پارچەیەك لە ئاسمان ئەبینێ‌و بڕیار بەسەر هەموو ئاسماندا ئەدات . ئەگەر وەك بەراوردێك تەماشای ئەم شیعرەو شیعری خەنجەرو خۆشەویستی بکەین ، ورد بڕوا نین بۆ هەلوێستی شاعیر بەرامبەر کێشەی نەتەوەیی خۆی‌و کێشە سەختەکانی جیهان جیاوازیەکی تەواو دۆزینەوەو هەست بەکەم نەفەسی‌و تەنگی بیرو ڕوانینی شاعیرانەی ئەکەین لە هەمان کاتیشدا ئەتوانین لەو پێشکەوتنە بگەین کە لە هۆنراوەی دوەمو خەنجەرو خۆشەویستیشدا هاتۆتەدی . بگرە هەر لەو سالەشدا ـ ١٩٧٣ ـ شاعیر لە بەخۆدا چونەوەو بیر کردنەوەدایە لە خۆی‌و لە دژواریەکان . لەو کاتەدا شیعرێکی وەك نوقلانەی خۆشەویستی‌و باران ئەنووسێ . ئەم شیعرە وەك ئەوی پێشوو جیهانی منالانی دێتە ناوو بەوانەوە ئەبەستری‌و ڕەوتی لەگەل ئەکات . بڕوانەتینی بروسکەی ئەو بیرەی بە گەشی بۆوردیلە کان‌و دوا ڕوژی مرۆڤ تەواوی‌بونی خۆی لەم دێدانەدا ئەتوێنێتەوە

**ـ هۆنراوەکەم کلۆمێکە دەروازەی**
**شاری گریانتان بۆ دائە خا**
**کلیلێکە دەرگای شاری**
**نان‌و گول‌و بەهارتان بۆ ئەکاتەوە ـ**
**وردیلەینە**
**هۆنراوە کەم پارانێکە تەپو تۆزی**
**سەر ڕومەتی دێیەکەمان**
**ئەشواتەوە ـ**

ئێستا پێویستە بێینە سەر ئەوەی بزانین ئاخۆ ئەو جوانیانەی دیاردەو کێشەی سەختی ژیانن چۆن دێتە شیعرەکانی ئەنوەرەوە ! وە چۆن ڕێگای خۆیان ئەدۆزنەوەو تێکەل بە ژیانی مرۆڤ ئەبن ! خۆ ئەگەر ئەو جوانیانە کەخۆیان‌ڕوالەتەوە ناوەرۆکیشن بریتی بونایە لە کۆمەلێ کاری گەری کاتی‌و هەلچونی دەرونی‌و بنج بەست‌بوتایە بە کاتێکی دیاری‌کراوەوە وەك هەمان پێناسەی ـ ئیفلاتون ـ بۆ جوانی ئەمانەوە . کە دروست ئەبێ‌و گەشە ئەکات‌و لە پاشدا ئەژاکێت . تەنانەت پێش بینی‌ی ئێمە لە هەندێ جێگەی ئەم نووسینەدا ئەوەبوو کە شاعیر هەر لە چوار چێوەی دەست‌پێ‌کردن‌و گۆرانە وردەکانی خۆیدا نامێنێتەوەو پێش ئەکەوێ . بگرە هەندێ لەو بیرورا ئایدیالیستانەش کە لەم لاولەو لاوە خۆیان لە شیعرەکانی ئەداو گەلێ

جاریش هۆی پێکهێنانی جۆرەڕوانینێکی ڕەش بینانە بوون ئەبینین لەو بەرەو پێشتر چونەدا لە خەنجەرو خۆشەویستیدا ئەبێ بە هۆنراوەیەکی چەپ ڕەوانەو خەستو چڕئەبنەوە . بۆ ئاسمانی پانو بەرینو ئەستێرەکانی ئاواتو دوا ڕۆژی نانو گوڵ باڵ ئەکەنەوە ـ

**ـ دڵی پاکی شاعیرێ درابوە بەر خەنجەر**
**زامەکانی بوبونە هۆنراوەی چەپ ڕەوانە ـ**

وە ئەبێ تەنها شاهێدی بوونی ئەم ڕاستییە لە ( خەنجەرو خۆشەویستی ـ دا دەربکەوێ بەڵکو لە ـ گولسورخی ـ پێشئەویشداو لە گەڵێ شیعری تریشدا ئەنوەر ئەیەوێ کانیاوی هۆنراوەی چەپ ڕەوانە لە ناخی توانای شاعیرانەیدا بتەقێنێتەوە . لە کولسور خیدا جوانی ئەبێ بە دوو بەشەوە دوو دەنگ وتو وێژێك لە نێوانیاندا دروست ئەکەن یەکێ پرسیار ئەکاتو ڕائەمێنێ ـ یەکێ هەقیقەت شی ئەکاتەوە . لە هەلو مەرجی تێکۆشانو بیری پێشکەوتن خوازانەوە تەقینەوەی نوێو جوانیەکانی دنیای شۆڕشگێڕی ئاگاداری ئەکاتەوە . لەپاش ئەمە ئەتوانین بڵێین لە سەراپای شیوەکانی ئەنوەردا جوانی وەك مەوزوعێکی تایبەتیو تێهەڵکێش بە کۆمەڵێ دواڵەتو بابەتی ژیانی کۆمەلایەتیو بیری نەتەوایەتی پێشکەوتن خوازانە دەرئەکەون . لەیەك جێگەدا ئاوەستنو باوەشی هەقیقەت بۆ بەسەرهاتو لێکدانەوە وردەکانی مرۆڤایەتی ئەگرنەوەو قولتر لە مەسەلەی نەتەوایەتی خۆی و کێشە خراوانەکانی جیهان ئەڕوانێت : ـ

**ـ بەناو سنگی ئەواندا پەخش ئەبمەوە**
**مردنیان ئەگردە پێیان**
**کۆچی زەردە لە تەمی دلیانا ئەخەم**
**کێلگەو کۆختو گولالەو کەژ**
**بۆ خەوی نزاویان ئەیەم**
**ئەبمە یارانو سبەینێ**
**بەسەر لوتکەدا دائەکەم ـ**

جوانی لای شاعیر خاکو خۆشەویستیو مرۆڤە ـ تیشکی ئالتونیو ئاخرەتو خەم فرمێسکە وردیلانی دێیەکەیو مەرگو ئاوازەکانی ـ پۆل ڕۆبسن ـ ٥ ـ جوانی لەمانا فەلسەفیەکەی نزیك ئەکاتەوە . ئەم پەیرەکەرو شۆین پێ هەلگرنی بە لەخۆیەوە دەستپێئەکاتو لە پاشدا ئەچێتە تاو کۆمەلو کێشە وردو گەورەکانیەوە . هەولێ تێپەڕین ئەدات چ لە واقیعێکدا کە باخی بوونو تێپەڕین هەروا کارێکی ئاسان نییەو ئامادەبی تەواوی ئەوێ ـ لە خوێندنەوەی زریاندا هەست ئەکەیت بە داهێنانی مرەو تیشکەکانی جوانی لە هەمرو ڕەنگو سەرچاوەیەکی خاوێن ، هەر لەم ڕێگایەوە لە زریاندا ئامادەبونو دروست بوون دێتە پێشەوە و تیشکی هەف پەرستیو یاسای مرۆڤایەتی پەخش ئەبنو ئازایانە وەك شاعیرێکی هاوچەرخی ئەو بەسەرهاتانەی هەموومان ئەگرێتەوەو زۆربەیان لە ناخەوە ئەمان هەژێننو بەرەو زۆر جێگای دیارو نادیار ئەمان بەن لەوێدا جارێکی تریش بە ژیاندا ئەچینەوە ـ بەرەو گەلێ هەلوێستی نوێ ئەبینەوە . ئەمە بە نرخو چۆنیەتی لەو شیعرانەدا کە ئێمە لەم سەردەمەدا لەهەستی ناسكو لێکدانەوەی هوشیارانەی ئەواندا پیویستمانە تەواو .

## دوالاپەڕە

### سەرچاوەکان

تێبینی

شیعرەکان کە بە نمونە لە نوسینەکەدا هێنراونەتەوە لە ـ زریان ـ داهەن ـ

١ ـ الازهار تورق داخل الصاعقه ـ حسین مردان ـ

٢ ـ موجز تاريخ النظريات الجماليه ـ م . اوفسيانيكوف

٣ ـ بەهەشتو یادگار فرمێسكو هونەر ـ گۆران ـ ز ـ سمیرنوفا ص٤٢

٤ ـ لاوكو پەیام ـ گۆران ـ

٥ ـ الماديه التاريخيه ـ ص٥١٧

٦ ـ رساله ذات بعد واحد ـ حسين مردان

٧ ـ بحث فی علم الجمال ص٤٤٩ ـ جان برنتلیمی ـ ترجمه الدكتور انور عبد العزيز

# دیموکراتیەت قەدەغەیە!

عەزیز نەسین
هوشیاری سیوەیلی
کردوویە بە کوردی

بە گوێرەی ئەو زانیاریەی کە لەم لاو لە ولا کۆمان کردبۆوە هەموویان کە شەست قوتابی دەووین هەوڵمان دا کە نەخشەی مامۆستا تازەکەی فیزیا لەمێشکماندا بچەسپێنین . ئەو مامۆستایەی کەماوەی نۆ ساڵ بوو لە ئەمریکا دەرسی دەوتەوەو پێشمان راگەیاندرابوو کە ئەم مامۆستا نوێیە لە هەموو ئەو مامستایانەی کە لە پێشدا وانەیان پێ دەووتینەوە جیاوازترە .

لە وانەی یەکەمی ئەم مامۆستایەدا ؛ یەکەر پێنج قوتابی تاقی کردەوەو ، پرسیاری زۆری لێ کردن ، بەڵام ئەوان وەکوو ئاو لەدنگا بکوتن . هەر کاتێك کە پرسیاری لێ دەکردن وەڵامیان دەدایەوەو دەیانووت : ــ

ئەمان خوێندووە .. فێر نەکراویم

ئەویش زۆر سەری سوڕ دەماو دەیووت : ــ

زۆر سەیرە ئەی باشە چۆن گەیشتونەتە ئەم پلەیە ؟! وا دیارەوو ئەم ووتەیەی مامۆستا هەستی نوریە پەتاتەی هاوڕێمانی بریندارکرد بۆیە ووتی ! ــ مامۆستا تۆ پرسیاری ئەو بابەتانەمان لێ دەکەیت کە هێشتا نەمان خوێندووە

ماموستا تازەکەی فیزیامان وەڵامی دایەوە .

ــ ئا تۆ وەرە ئێرە

نوریە پە تاتە ئەم داوایەی مامۆستای بەشتێکی غەریب زانی و بەسەرسوورمانەوە لەپاڵ تەختە رەشەکەدا وەستا هەتا مامۆستا پێی ووت : ــ

باشە ئەوەی دەیزانیت و ئەوەی خوێندووتە لە فیزیادا بۆمانی باس بکە . نوریە پەتاتە وەڵامی دایەوە :

لە فیزیادا .. لە فیزیادا

وورده رووره‌و توانای بەرز دەبوویەوەو نزم دەبوویەوە پاشانی نەیتوانی تەنیا روشەیەك بلرکێنێ .

ئەم مامۆستایە ! جگە لە وانە وانە ووتنەوە ، ئا رەوزەوویەکی تری هەبوو ئەویش فێرکردنمان بوو لە شێوازی دیموکراتیەت ! لەو کاتەشدا ووشەی ( دیموکراتیەت ) لە لامان زۆر غەریبەو نەناسراو بوو هەر لەم سالانەشدا بووکە ووشەی (ڤیتامین) یش تازە هاتبوە تورکیاوە لەبەر ئەوەیش کە ووشەی ( دیموکراتیەت ) و ( ڤیتامین ) زۆر درەنگ گەیشتە وولاتەکەمان ، هەموومان سوور بووین لەسەر ئەوەی کە لەقەبی ( بەهیچ دیموکراتی ) لەو مامۆستا تازەیە بنێین ئەویش لەبەر ئەوەی کە زۆر زۆر باسی‌و وەسفی دیموکراتیەت دەکرد لەئەمریکادا ! هەر شەست قوتابیەکە نە فیزیا فێر بووین نە دیموکراتیەت سەرەڕای ئەوەی کە هەمیشە هەوڵی لە گەڵدا دەدایـن ، هەتا کۆتایی ساڵ تەنیا دووشت لە دیموکراتیەت فێر بووین ، یەکەمیان پێویست بوو لە لەسەرمان کە هەر یەکەمیان لەناو خۆماندا بانگی ئەو تیرمان بکەین بەووشەی ( کاك یان بەرێز ) لە جیاتی ( ئۆلان ) و یان ( سێیست ) یان ( طلح منیسنی ) وەیان ( هـێی ) وە دووەمیان ڕا وەرگرتنی هەموومان بوو لەسەر ئەوەی کە ئایا پەنجەرەکان یاخود دەرگاکە بە داخراوەیی بمێنیتەوە یان بکرێتەوە .

هەندێك جار مامۆستای فیزیامان [ بەهیچ دیموکراتی ] دەیووت :ــ براکانم ! ئەگەر هەوا گەرم بووبا پەنجەرەکان بکرێنەوە ! ، لەو کاتەدا دەنگێك بەرز دەبوویەوەو دەیووت ــ گەورەم ، با پەنجەرەکان بکرینەوە ، هەندێك لە قوتابیەکانیش خەریك بوون لە پێکەنینا ئەپچڕان هەر زووش خۆیان بۆ ئەمە ئامادە دەکرد، پاشانیش هیچمان دەنگمان لێوە نەدەهات ، تەنیا یەکێك یان دوانمان ئەبێت کە ئەوانیش چەنەبازترین نموونەبوون لە پۆلەکەدا ! ، دەیانووت:

ــ نەخێر ، گەورەم نابێ وابێ ....

لە دوای ئەمەوە یەکەر شێوازی دیموکراتیەت دەستی‌پێ‌دەکرد : ــ

ــ گەورەم بابەنجەرەکان بکەینەوە

ــ نەخێر ، گەورەم

— بابیان کەینەوە ..
— نابێت
— خەریکە ئەتەقێن لە گەرمادا
— خەریکە ڕەق ئەبینەوە لە سەرمادا .

نوری‌یە پەتاتەو جامر شەوکەت ئەم سەراوسەری دەمەتەقێکەبوون ، ئەگەر ڕۆژێك یەکێکیان بیووتایە ( بابیان‌کەینەوە ) بۆ ڕۆژی دوایی دەیووت ( بادایان‌خەین ) هەر چیش جامر شەوکەت بیووتایە نوری‌یە پەتاتە بەر پەرچی دەدایەوە ، بەڵام هەندێك جار کە یەك ڕایان دەبوو ، ئەگەر هەوا گەرم وایە پەنجەرەکانیان دادەخست‌و ئەگەر ساردبوایە ئەوا دەیانخستە سەرپشت لەکاتێکدا ئێمە لەم بەزمەدا بووین ، نیوەی ماوەی دانەکە بەفیڕۆ دەڕۆیشت‌و ئەنجا بە هیچ دیموکراتی دەیووت نـ با یەکێك لەو کەسانەی کە پێی ناخۆشە پەنجەرەکان بکرێتەوە بێتە دەرەوەو ڕای خۆیان بەتەواوەتی بۆ ڕوون‌کاتەوە ، پاش ئەمەش بەشی دووەمی شێوازی دیموکراتیەت ! دوایدا دێ لەبەر ئەوەی کە ئێمە لە گەرمەی دەمەتەقێماندا بووین‌و هەریەکەمان بەووشەی ( ئۆلان ) بانگی ئەویتری دەکرد ، هەندێك‌جار بەهیچ دیموکراتی قسەی پێ دەبڕین‌و دەیووت : ـ

براکانم ، باشی بزانن کە لە دیموکراتیەتدا ووشەی ( ئۆلان ) نیە لە جیاتی ووشەی ( کاك یان بەڕێز ) بەکاردەهێنرێ پیویستیشە بەو دوو ووشایە گفتوگۆ لەگەڵ یەکتریدا بکەن بو سەری هەزار جارە ، ئەم ووشانەی بۆ دوویات دەکرێتەوە ، لەسەرەتادا ، بە کاك ئەحمەدیان کاك محەمەدی بەڕێز قسەمان لەگەڵ یەکتری دەکرد ، بەڵام دوای ئەوەی کە توزێك دەمەتەقێکەمان گەرم دەبوو ، ئەمان دەتوانی بەسەر خۆماندا زاڵ‌بینو لە پڕێکداو هەر لە خۆووە ووشەیەکی ( ئۆلان ) مان لە دەم دەردەچوو لەوکاتەدا زەنگی پشوو لێ‌ی‌دەداو بە هیچ دیموکراتی لەپۆل دەچووە دەرێ‌و ئێمەشی بە دوایدا هاوارمان‌دەکرد

— هەر بژی دیموکراتیەت !!

بە درێژایی سالی خوێندن بەم جۆرە وانەی فیزیامان بەڕێ‌دەکرد بە هیچ دیموکراتیش لە دلی خویدا وای لێك‌دەدایەوە کە دیموکراتیەتی لە مێشکماندا چەسپاندووە . لە پێش کۆتایی هاتنی ئەو ساڵە ، بە هەفتەیەك‌یان دوو هەفتە پێ‌ی ووتین : ـ لەم هەفتەیەدا ئەزموونێکی دیموکراتی لە هۆڵی موحازەراتا پێك دەهێنین

پۆلەکەشمان ، بۆ سێ بەشی دابەشی‌کردبوو ، هەر بەشێك چەند بازێك بەڕێوەی دەبرد، هەمووشمان بەتەواوی خۆمان بۆ ئەو ئەزموونە ئامادەکرد .

ڕۆژی هەینی ، ئێمەو ئەو مامۆستایانەی کە بە هیچ دیموکراتی لە قوتابخانەکانی‌ترەوە بانگی کردوون ، کۆبووینەوە . لەگەل هەندێك شەخیاتی‌ترا کە لەوەو پێش ئەمان دیبورن خۆیان لە نزیکەی پەنجا پیاوو ژن دەدا بێجگە لەمان مامۆستای وانەکانی‌تریش ئامادەی ئەزموونە دیموکراتیەکەمان ببوون ئەمەراو سەری هۆلەکەیان گرتبوو ، لە کاتێکدا کە ( سینایەچەکل ) و ( حیلمی‌پەڕەش ) لەگەڵ جەماعەتەکانیان هەموو لایەکی هۆلەکەیان گرتبووەوەو پلانەکەشمان لەوەو پێش دانابوو ، ئامادەمان کردبوو بی دەنگیش باڵی بەسەر هۆلەکەدا کێشابوو ، لەو باوەڕشدابووم کە قوتابخانەکەمان لە مێژووی خۆیدا بێ دەنگی وای بە خۆیەوە نەدیبوو ، هەتا وای لێ هاتبوو کە کاربەدەست‌و ماموستاکانی وەزارەتی پەروەردەشی بە چرپەوە قسەیان دەکرد ، هەر لە ڕوانینەکانیا نادیات ـ بوو کە زۆر بەکردارو ڕەفتارەکانمان موعجیبین زۆری پێ‌نەچوو بەهیچ دیموکراتی سەرکەوتەسەرەوە بۆ بەردەم مایکروفون لە پاشی ئەوەی کە بەخێرهاتنی بانگکراوانی کرد ، باسێکی کورتی لە درووست‌بوونی دیموکراتیەت کرد ، لەگەڵ بەرکولێك لە تازەترین شێوازی دیموکراتیەت لە ئەمریکادا کردەوە کە هەندێك لە بنەچەکانی دیموکراتیەت لە لە قوتابخانەکەماندا چەسپیوەو پاشان ووتی : ـ

— ( ئۆلان ) تۆ لەگەڵ کام لای !

بەچرپەوە وەڵامم دایەوەو کەمن لەگەڵ ئەوانەدام کە دەڵێن « بابیان کەینەوە » ...

— لە بیرێ نەچێ‌و پرسیار لەوەی تەنیشت بکەو .. هیچ مەشلەژێن ...

هەمومان بە شێوەیەکی ڕێك‌و پێك ئامادە بووین هەمووشمان لامان ڕوون‌بوو کە ( بەهیچ‌دیموکراتی ) بۆیە ئەمەی کرد بۆ ئەوەی کە تێڕوانینی خۆی بەرامبەر بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان بچەسپێنێ چونکە بەڕێوەبەرمان حەزی لەو شتە نەدەکرد کە پێ‌ی دەوترێ ( دیموکراتیەت ) ئێمە هەمومان دەمیک بوو ئاگاداری ئەمە بووین چەند جارێکیش گوێمان لێ بوو کە لەبەردەم ڕووی مامۆستایانـدا

دەبقیژاند : ـ

— بلیم .. ئەمەیە دیموکراتیەت؟

جاریکیان کە بەهیچ دیموکراتی لە پۆلەکەمان دەهاتە دەرێ ئێمەش بە دوایەوە هاوارمان لێ هەڵسا : ـ هەر بژی دیوکراتیەت ئەوەندەمان نەزانی‌کە بەڕیوەبەر خێرا خۆی کرد بە پۆلداو هەر یەکسەر زللەیەکی زۆر توندی مالی بە پەنا گوێی نوریە پەتاتەدا ، ئەو وەکو قەلایەکی دیموکراتی لە جێگەای خۆیدا نەجوولا ، بەڕێوەبەریش لەبەر توندی کاردانەوەکەی نوریە پەتاتە بەرەو لای‌دیوارەکە گەڕاوە دواوە ، پاشان یەکسەر بەر جامر شەوکەت، بەلام کاتێك بینی ئەمیش وەکو نوریە پەتاتە نەجوولاوەتەوە ، دەستی‌کرد بە گەڕان لە ناوماندا بۆ قوتابیەکی زۆر بچووك دەگەڕا تا داخی دلی خۆی پێ بڕێژێ ، لەناو هەموویاندا منی دۆزیەدەو ملی گرتم منیش بەرەو ڕووی قێژانم : ـ

— بەزاتی خوا ئەم ووتووە « بژی دیموکراتیەت » کاتێکیش کە لە پۆل چووە دەرەوە ، گوێمان لێ‌بوو کە بە مامۆستایەکمانی دەووت : ـ خووی قوتابیەکانیش خراپ کردووە بە گوێرەی ئەم ڕووداوانە دەمانزانی کە شەڕێکی سارد لە نێوان بەڕێوەبەرو بەهیچ دیوکراتیدا هەیە، دیاریش بوو کە یەکێکیان هەر لەم شەڕەدا سەردەکەون لە ڕاستیدا حەزمان دەکرد کە هەر بەهیچ دیموکراتی سەربکەوێ ، چونکە ئەگەر مامۆستاکانی تریش دیموکراتیەتی کردنەوەو داخستنی پەنجەرەکانی بکردایە بەپێشەی خۆیێ ، ئەوا بێ گومان لە هەموو وانەکانماندا دەحەسانەوە .

بەهیچ دیموکراتی ، یەکێك لە پیاوە بە ساڵاچووەکانی ڕیزی پێشەوە بانگ‌کردو پێ‌دوت : ـ

— تکا لە بەرێزتان دەکەین ، کە بە بابەتێکمان بۆ هەلبرێژن بۆ ئەوەی دەمە تەقێی لەسەری بکەین . پاشان پیاوە بەساڵاچووەکە پێی ووتین : ـ بەرێزان وەك ئاشکرایە [ عەقلی باشی لە لەشی باشدایە ] ئەمە پەندێکی گرنگی کۆنە ، ئایا ئەم پەندەتان بەلاوە ڕاستە ؟ یا هەڵەیە ؟ لە سەرەتادا با ئەوانە قسە بکەن کە بەلایانەوە ڕاستە ، پاشانیش ئەوانەی کە بە ڕاستی نازانن ، لەدوای تەواوبوونی دەمەتەقێکەشی بڕیار دەدین ، ئەمجا با هەردوولا ڕایانبدەن بە دەستەوە لەمیانەی‌ڕاکانیشدا ، ڕاستیەکەمان بۆ دەردەکەوێ‌و ، ئەمەیە دیموکراتیەت .

پاشی قسەکەی من .. بەپێی ئەو پلانەی کە لە پێشدا دامان نابوو پڕ بەدەم قیژانم :

— با پەنجەرەکان بکەینەوە !!

دانیشتوان هەموو سەریان سوورما زۆری‌پێ‌نەچوو کە یەکێك لە جەماعەتی ( سینایەچەکل ) هاواری کرد : « نەخێر .. با پەنجەرەکان دابخەین » ، هەموو بیرو هۆشمان لای پەنجەرە کردنەوە پەنجەرە داخستن بوو ، بەدرێژایی ساڵی خوێندن‌و لەوانەی فیزیادا دەمەتەقێی ئێمە تەنیا لەسەر ئەم قەوانەبوو ، . لەپاش ئەوەی کە من هاوارم کرد .. ( باپەنجەرەکان بکەینەوە ) لە ریزی‌دواوە دەنگدانە وەیەك بۆ دەنگەکەم پەیدا بوو ودەیووت : ـ

— گەورەم با پەنجەرەکان داخەین . پاشان هۆلەکە ژاوەژاوێکی گەورەی تێ‌کەوت .

— با بیان‌کەینەوە ..

— یا دایان‌خەین ..

لەبەر ئەوەی کە من یەکەم کەس بووم هاوارم لێ هەڵسا بەهیچ دیموکراتی بانگی کردم‌و ووتی : ـ

— ئا تۆ وەرە ئێرە ، ڕای‌خۆتمان بۆ ڕوون‌کەرەوە .

چاوەڕوانی شتی وام نەدەکرد بەلام هەر چونێك بێ چوومەلای مایکروفونەکەو لەگەلیا هەردوو قاچەکانم وەکو شەقشەقە کەوتنە لەرزین ، بەهیچ دیموکراتی کەوتە پرسیارکردن‌و ووتی : ـ

کاك حەسەن ، ڕات چی‌یە ، ئالی عەقلی باسی لە لەشی باشدایە یان نەء ؟

منیش یەکسەر وەلام دایەوەو ووتم : ـ گەورەم با پەنجەرەکان بکەینەوە . کە وام ووت جەماعەتی ( سینایەچەکل ) تەقینەوەو بەیەك دەنگ هاواریان کرد : ـ

— گەورەم .. با دایان‌خەین .

لە لایەکی ترەوە جەماعەتەکەم پالیشتیان کردم‌و هاوادیان کرد : ـ

— نابێ ، گەورەم .. با بیان‌کەینەوە

ڕەنگی بەهیچ دیموکراتی بە تەراوەنی گوراوە لە سوورەوە بوو بە شین‌و ڕووی تێ‌کردم‌و موتی :

— بە باشی گوێ بۆ پرسیارەکە شل‌بکە ، لەش باش یان عەقلی باش ؟

من سەرم سوورماوور ، دانیشتوانیش گەرمی دەمەتەقێ‌بوون : ـ

بێ گومان ، لە پێشدا ، لەش باشی .. چونکە لەش نەخۆشی...

— ئەگەر رابێ ، پێویستە کە بوکسەرەکان وزورانبازەکان فەیلەسوفەو پیاوە بەرزەکان ....

دیان بە هیچ دیموکراتی وتیەوە : ـ

ـ پێمان بڵێ ..

ـ گەورەم ، ئەی ئەمووت با پەنجەرەکان بکەینەوە

بەهیچ دیموکرتی نەیدەزانی چی بکاتو نارەتی شارەزاریشا تکتک بە ناو چاوانیا دەهاتە خوارێ . پاشی بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ کردنەوەو داخستنی پەنجەرەکانمان لە بیر بباتەوە ووتی:ـ

ـ باشە قەیناکا . ڕای خۆتمان بۆ دەربڕە .

ـ گەورەم ، لەبەر ئەوەی کە ئێمە لە مانگی ( نیسان ) داین، نیسانیش مانگی دووەمی وەرزی بەهارە هەر لەم مانگەدا ، شەماڵو بای وەرزیی دڵڕفێن هەڵدەکاو خۆ ئێمەش نەمردووین هەتا سیەکانمان لەو بای‌شەماڵە بێ بەش بکەین ...

ئەم ڕستانەی کەدەمووت بە درێژایی ئەو ساڵە لەوانەی فیزیادا وەکوو ئاوو دۆ لە بەرم کردبوو وەکوو بولبولیش دەمووتەوە ، هیچ قسەیم نەهێشت و چیم پێ بوو دام بە ڕوویدا ، پاشان بەهیچ دیموکراتی ( سینابەچەکل ) ی بانگ‌کرد ، کە دەبووت : ـ من لەگەڵ ڕاکەی ( پالانحەسەن ) دا نیم . بەهیچ دیموکراتی وەڵامی دایەوە : ـ ئێمە دەزانین کە لەو دیموکراتیەتەدا « کاک » یان (بەڕێز) بەکاردەهێنرێ.

لەبەر ئەوەی کە هەر یەکەو لە قوتابخانەکەدا نازناوێکی هەبوو مینشیان ناونابوو ( پالانحەسەن ) لە دڵی خۆمدا بڕێکی باش خەفەتم خوارد چونکە لەبەردەمی ئەو هەمووەدا کە دانیشتبوون بە پالانحەسەن ) بانگی‌کردم ، منیش بە بەرامبەر ئەمەیدا بانگم‌کرد : ـ

ـ ئۆلان ، بێ قیمەت .. زمانت بگرە ...

بەهیچ دیموکراتی هەڵی‌دایە ووتی : ـ کاک حەسەن لە بیرت نەچێ بە ( کاک ) بانگی بکە .

لە کاتێکدا کە ئێمە لەم مشتو مڕەدا بووین ، ئامادەبووان هاواریان دەکرد : ـ سەر .. لەش. دەمەتەقێکەش لە نێوان دوولا دەسووڕایەوە ، لە کاتێکدا کە ئێمە لە نێو خۆماندا هاوارمان دەکرد کە پەنجەرەکان بە کراوەیی بهێننەوە یان دابخرێن،دانیشتوانی بانگکراوانی ناو هۆڵەکەشی لە دەنگدانا جیاوازبوون ، کە لە پێشدا (سەر)ە یاخوود (لەشی)ە .

نوری‌بە پەتاتە هاواری کردەوە : بابیان کەینەوە ..

حیلمی‌بە ڕەش بەربەچی دایەوەو ووتی : با دایان‌خەین لەم کاتەدا بەهیچ دیموکراتی ڕووی پرسیاری‌کردە حیلمی‌بە ڕەش‌و ووتی : ـ

ـ باشە بۆچی پەنجەرەکان داخەین ؟

حیلمی‌بە ڕەش بە هەموو ئەو هیچو پووچی‌یەوە کە لە مێشکیدا چەسپیبوو ، بۆ پالپشتی کردیش لە داخستنی پەنجەرەکانی ، وەڵامی دایەوە ، بەڵام ( دیموکراتیەت ) بێ‌و لەعەقڵو مێشکیدا نەمابوو ، منیش وەك شێر هەڵچووم رووم‌کردە حیلمی‌بە ڕەش‌و پێم ووت : ـ

ـ ئەی گوێ درێژ ....

بەڵام باشی‌بوو خێرا بەسەرنەفسی خۆمدا زاڵ‌بووم ووتم : ـ

کاك حیلمی‌بە ڕەش ، من ڕاکەم تێدا نیم بەڵام ئەو پەخەی وەڵامی دامەوە : ـ

ـ ئۆلان جوینی‌دا

تێك هەڵچووین‌و بەڵام سەد شکور بۆ خواکە نوری‌بە پەتاتەو شەوکەت زوو هاتن بە دەنگمانەوە ، ئێمە ئاواتەخواز بووین کە ئەمە ڕوونەدا بەڵام وادیار بووکار لە هەزەلیاتەوە بەرەو ڕاستی ئەچوو کاتێك کە ئێمە لەسەر کردنەوەی پەنجەرەکان سوور وبن ئەوانیش لەسەر داخستنیان سووربوون سەیرێکی دانیشتوانم کرد بەڵام ئەوانیش لە ئێمە خراپتربوون ، لەم گەڕە لاوژەدا دەنگی بەرێوەبەر وەك چەخماخەو نالەی هەورە بروسکەیەك لە ناو هەمووماندا بەرزبوویەوە ، هەموو شمان واقمان وڕمابوو کە ئەم دەنگە لەم کابرا کورتەبنەرە چۆن پەیدابوو ، هەر لەگەڵ دەنگەکەیدا هەموو وەك پشیلە مالیمان لێ‌هات، یەکە یەکە سەرنجی بەرێوەبەرمان دا ، ئەویش . بۆ نەگبەتی لە ناو هەمووباندا ڕووی کردە من ووتی : ـ چی ڕوویداوە؟ وا بەهیچ دیموکراتیش وەکوو سووتاوی لێ‌هاتووە . منیش وەڵامی بەرێوە بەرم دایەوە . کە بەردەوام سەیری دەکردم

ـ کاك حیلمی‌بە ڕەش‌و کاك سینابە چەکل .... پاشان تەنیا ووشەیەکی ترم بۆ نەورکێرا ئەنجا ئاگام لە زللەیەك نیەبی کە ئاگری لە چاوم دەکردەوە ، ئاگام لە هیچی تر نەما بە هیچ دیموکراتیش لە قوتابخانەکەمان نەما ووردە ووردە خەریك

ـ بوو ئیش‌و کار جێی خۆی

دەگرنەوەو لە دوای ئەو رۆژە شەوە هەر کاتێك بەرێوەبەر پەنجەرەکان بــــە داخراویی ببینێ دەڵــــێ : دیموکراتیەت قەدەغەیە ، پاشان یەکەیەکە پەنجەرەکانی دەکردەوە .
ئەگەر بەکراوەیش بیان بینی دەڵێ : ـ
ــــ دیموکراتیەت قـــەدەغەیــە پاشـــان یـــەکەیـــەکـــە دای‌دەخـــستنە ئێستا وەکـــو خۆشتان دەزانـــن جامـــر شەوکەتو حیلمی یە رەش‌و سینایە چەکل‌و نوری‌یە پەتاتە لە گەورە پیاوانی ســـیاسی‌و وڵاتەکەمانن ، بەلام من بەهیچ نە بووم .
پاش چەند ساڵێك بەرێکەوت تووشی یە هیـــچ دیموکراتی بووم‌و پێم‌ووت : ـ گەورەم چۆنـــی ! وا دیاربوو کە پیر ببـــوو چونکە لـــە سەرەتادا نەیدەناسیمەوە لە ماوەی گفتو گۆ کردنیشما ناندا
ــــ هـــەر تاوە ناتاوێـــك دوو پالی دەکردەوەو دەیووت :
ــــ لە پێشـــــیدا ، پێویـــــستە دیموکرایەت لە وولاتەکەماندا بچەسپینین لێ‌بینی
ئەم چیرۆکە لە ئەستنبوڵ لە ســـالی ١٩٧٤ دابـــلاو کـــراوە بەدەستکاری‌یەکـــی کـــەمـــدا وەرگێرورا



# نامەکەی خۆزوبیست

نامەیەکی بەنام‌و بۆمان لـــە قوتابـــی کـــاك ( خۆزوبـــست ) ەوە بۆ هاتووە کە تێدا گلەیی‌و بیزاری بەرامبەر بەرەخنەی رەخنەگران‌و هەندی لەنووسەرانی وشەی کوردی دەرئەبرێت ، کە بەرهەمەکانیان لـــە رۆژنامەر گۆڤارە کوردی یەکان دا بلاونەکەنەوە .
جا سەبارەت بەوەی ئەو بێنراری‌و نارەزاییەی ناوبرا پێشـانیان ئەدات ـبەلای ئێمەوەـ لە دەروونێک پاکو بێ گەردەوە هـــەلقولاوەو تەنیا بۆخـــزمەت‌و پێشخـــستنی وێژەی کوردی نووسراوە . وەکو ئێمە هەستی پێ‌ئەکەین ئارادەیەکی باشی زیرەکی‌و بلیمەتی‌و بەسەلیقەیی ئەو قوتابیە دەرئەخات وە بۆ هاندانی ناو براوو پێشخستنی لەم رێگایەوە ، گول بژێری‌یەك لەنامە درێژەکەی ئەکەیـــن‌و هەندیـــن لەرەخـــنەو

پێشنیارەکانی نەخەینــە بەردەمــــی خوینـــــدەوارە ئازیزەکانمان هەروەك خۆی بۆی چوە بە نیازی ئەوەی نامەکانیان پتر بهەژینن بەلکو زۆرتر بیروورای خۆیان بەسەربەستو بێ سڵکردنەوە و خزمەتی گەلی کورد دەربرن کە گۆڤارە رۆشنبیری لەلای خۆیەوە بە هەمو دلخوشی‌و بەختیاری‌یەوە بــلاوی بکاتـــەوە کـــاك خۆرویست نامەکەی بەم جۆرە دەست پێ ئەکاتو ئەلێ :

جاران پشیوی ئاژاوەی نێوان خێلەکان . لەسەر زەوی زارو ، شەرە قـــەو بەیەکا پژانـــی خیزانو دراوسیکان لە سەر شەرەمنال بە دوا کەوتوویی‌و نەخوێندەواری لەقەلەم ئەدرا ، بەلام ئێستاکە ئـــەم پێکابژانو بەیەك هەلشاخاندنە لەوی گوێزراوەتەوە ناو رۆشنبیری وخوێندەوارانمانەوە تەنیـا جیاوازی ئەوان لەسەر ئەو شتانەی لە سەرەوە باسمان کردوون بەلام ئەمان واتەخوێندەوارو روشنبیران لەسەر جۆری ( نوسین ) و ( رێزمان ) وشتی تری لەم بابەتانەیە بەلێ ئەوسا پێمان ئەگوترا نەزان ، دواکەوتو .. ئەگەر لیس وشاندنیش لە نیواندا بەکاربهاتبایا ، هەمـــوو کەسی بەلایانەوە شتێکی ئاسایی بوو بەلام ئەی ئیستا چی‌یە؟!

کاك خۆرویست پرسیار ئەکات و ئەلێت :

**ئەگەر نەزان رێی راستی لێوونبو خوا زانا بگرێ**
**ئەگەر زانا رێی راستی لێوونبو خەتای کێ بگری ؟**

دوای ئــــەمــــــە نوســــــەر ئــــەلیــت هەتاکەی خوێندەوارو روشنبیران ئەمە کاریان بـــی وبۆیەك ئاوابن بێ‌گومان نەخوێندەوارمان هەرگیز چاك نابن برایان : چارەیەکی زمانو رینووس ورێزمانـــی کوردی بکەن ... شێوەیەکی راستی بۆ دابنێن کــە منالانی کورد لەسەر ئەو رێرەوە بنوسن وبخوینەوەو وەشتی جوان وزانـستی راست فیربن پێنووستان بۆ چاوی یەکتری تیژ مەکەن .. مـن قوتابیـم هیواو ئارەزوم لە خوندنەوەو نوسراو شتی بەکەلکو باشو روشنبیرم ، بەلام بەداخـــەوە زۆر جاریــش هەیە لەباتی شتی بەکەلك تیرو توانج وقــەی رەق وناخۆش ئەخوینمەوە ،

کاك خورویســتهیواو ئاواتی ئەمەیە کەهەمـو لایەك خەریك بن بۆ دانانی رینوسێکی راســـت بــۆ قوتابخانە کوردیەکان هەندی ووردکاری وبـــیر تیژی خۆی بۆمان دەرئەخات وەکو چەند پێشنیارێك بــە لێکولینەوە ئەیخاتە پێش چاو وئەلێت :

من لام‌وایە پیتی بزوێنی کورتی (و) کە بەلاتینی بەم چەشنە دەنووسرێت (u) بۆ ئەوەی لەپیتی بێ‌دەنگی ( و W ) جیابکرێتەوە بـــەم چەشـــنە بنووسرێت باشە (و) وەکو : کوردە یان وورد وهی‌تر وە پیتی بزوێن (ی) درێژیش کە بەلاتینی بەم چەشنە دەنۆسرێت ( i ) بەم چەشنە بنۆسرێت (ی) وەمن لامەوایە پیتی بزوێنی (ی)کورت کە بەلای خۆمەوە بە (کسرە)ی عەرەبی لەقەلەم دەدەم وە زویش کە ئەلف وبێ عەرەبی‌یە کە بێ‌دەستکاری (کوردی) پێ‌نوسرا لــە جیاتی ئەم پیتەی ئێستا ئەوسا بە (کسرە) دەنووسرا بو نموونەووە ئیسلام بەم چەشنە دەنۆسرا : ـ اسلام بەم چەشنە بنووسرێت باشە : ی وەکو گیرفـــان ، هەرگیزو هی تر . وە وام بەلاوە اشە بەلاتینی بـــەم چەشنە بنووسرێت : ـ ( i ) وەهەروا بۆ ئەوەی پیت بۆ دەنگی (ی) بزوێنی هەرە کورت کە بە عەرەبی پێی دەڵێن ( الکسره المختله ) وەهەتا ئێستەشی لە ئەلف وبێی عەرەبی دا پیتی بۆ دانەنراوە من وام بــە باشی‌زانی کە خەتێکی باریك و کورت لە ژێر ئـــەو پیتانەدا دابنێم کە ئەم دەنگەیان بە دوواداێت وەك : من بەم چەشنە بنووسرێت : ـ من ، یان سەرچنار بەم چەشنە بنوسرێت ( سەرچنار ) ئەم پیتە (ب) بەلاتین بەم چەشنە دەنووسرێت : ـ ( i ) هەر ئەمەش منی هان داکە پیتی ( u ) ی قەلەو حەوتەکەی لەسەرەوە بنووسرێت تا ئەگەر نووسیمان ڕستە بەم چەشنە بینوسین ـ ڕستە نەك ) ڕستە ( چونکـــە ئەمەی دووایان رەنگە ببێتە هۆی بیرچۆنی یەکی لــە پیتەکان لە کاتی نوسین دا ، بە کورتی ووشەکانی خۆم لە رستەدا بەم چەشنە دەنوسیم : ـ

**ئازاد قوتابی یەکی زیرەکە**
**دایکم ژورەکەی مالی ( گیسکی‌دا )**
**خوندن بۆ مرۆف پێویستە**

من وەکو ودێم ئەمە شێوەی ئەلفو بێ‌کەمەوە مامۆستای کوردی یقوتابخانەکەشم زۆری بەدلە ، من زۆر لەکەس ناکەم بۆ ئەوەی بە ئەلفو بێ‌کەی من بنۆسی من هێشتا قوتابیم ئاواتمە پاشەرۆژ ببمـــە نۆسەر هەر بۆ ئەمـــەش زۆر نۆسراوە ری چیرۆك ورەخنەو زمانەوانی دەخونمەوەخوندومەتەوەوەچاکیش بزانی کە من ئەم ئەلف وبی یەم لە خۆمەوە دانەناوە بەلکو لە ئەنجامی خوندنەوەی ئەو ســەرچاوانـــەوە کەوتووە کەلە ٢ ساڵ لەمەوپێشەوە دەردەچن ئیتر هیڤی‌دارم نامەکەم ببێتە کۆتری ئاشتی ویەکێتـــی وبخاتە ناو تانەوە ، ئیتر سوپاس ..



# بۆلاوێکی کوردی
# باوەڕی نەبەز

گڕی ئاگر با بە ئەوژم
شاڵاو بێنێ
من ناسووتێم
من پۆڵەمو ئاوێمەوە
گەر سووتاشم سارد ئەبمەوە
باگشت دەریای ئەم جیهانە
لافاو بێنن
من دار بەڕووم ناشکێمەوە
با ڕەشەباو گەردەلولیش
قوڵی خۆیم لێهەڵبکات

مامزی کێوێم تەل نابمەوە
با ئەشکەوتوو کە پرووخانوو
گشتی قاپی خۆی لێم لێم داخا
سەرمام نابێ
بێچوی بەفرو لوتکەی بەرزم
با گەڵای دارگشتی بسووتێ
هەڵبوەرێ
تیشکی هەتاو نام سووتێنێ
خۆم ئاگرم .

• یادگو کوێی •

دیارە من کە وای بێ نەڵێم مەبەستم ئەوە نی‌یە بڵێم گەیوەتە کەماڵ بۆیە گۆڤاری یەکەمە . ڕەنگــە زۆری مەسەلەکە لەوەوە بێ کە کورد هێشتا زۆر شتی نی‌یە ، بۆیە ( ڕۆشنبیری نوێ ) گۆڤــاری یەکەمیەتی ، بەڵام خۆ هــەرچۆن بێ بە ســەنگ و ترازووی ژیانی ئەمڕۆمان گۆڤــاری یەکــەممانەو ، ئەمەش بەسە بۆ شانازی .

( ڕۆشنبیری نوێ ) لەو ڕۆژەوە کــە پاش هەڵسانەوەی لەدوای تێکلانێکــی ناچاری ڕووی کردووەتە گەشەکردن ، ژمارە بە ژمارە بــەرەوپێش ئەچێ و ، ئێستا بووە بە بەرفراوانترین گۆڤــاری ئارادەیەك ڕێك و پێك و بەپێزی کوردی و ، باشــترین قەڵەمی هەڵــوڕاوو چالاکی کوردیی لە هەمــوو بابەتێك لە دەوری خۆی خڕکردوەتەوە .

بەئومێدم لەمەوپاشیش ، وەك لەمەوپێش ، هەر لە گەشەکردنا بێ و قەڵەمی چاکترو بەپێزتر لــە دەوری خۆی کۆکاتــەوەو ، نووســینی لەبارەی ناوەڕۆکەوە پوختترو خەستترو هەمە ڕەنگــەترو هەمە جۆرەترو ، لەبارەی فۆرمەوە ڕەوانترو بێ‌هەڵەتر ڕاکێشێ بۆ لای خۆی‌و ، هەردەم‌لە بەرگێکی جوانترو کاڵایەکی قەشەنگترا خۆی بنوێنێ .. ببێ بە مێرگێکی ڕاســتە قینــەی دیموکراسی ، هەموو بیرێکــی پێشکەوتخوازی تیا بگەشێتەوەو هەمــوو گوڵێکــی جوان‌و پڕ بۆن‌و بەرامەی تیا بپشکوێ ..

هیوام ئەوەیە لەم ساڵی نوێ‌یەیدا لە چاپخانەی تایبەتیی دەزگای کولتووری کوردیدا لەچاپبدرێ .. ئابووری‌و فەلسەفەو هونەرو ئەدەب‌و سیاســەت‌و زمانەوانی‌و زانستە ڕووتەکان‌و مێژوو .. هــەموو بابەتێکی‌تری پێویستی لەپاڵی یەکدا تیا بڵاوبکرێتەوە .. لە هەموو دەمێکــی ڕابوردوو زیاتر گۆڤــاری ڕۆشــنبیری‌و ڕۆشــنبیرانی ڕاستەقینە بێ‌و ، ڕۆژبەڕۆژ هەر نوێ بێ‌و هــەرگیز لــە کاروانی نوێ‌خوازی دوانەکەوێ .

• محمدی مەلا کریم •

## بیروڕای سەربەست

### لە پێشوازی لێ کردنی ساڵێکی نوێی ئەم گۆڤارەداو ، بە هیوای هەموو شتێکی نوێ ..

سەرەتا کە دەرچوو ، لە دەفتەرخانەی خەیاڵی ـ لاموایە ـ کەسدا نەبوو ببێ بە گۆڤار ، چجای ئەوە کە بشبێ بە گۆڤاری یەکەمی کوردی لە عێراقدا . کاربەدەستەکانی ئەوەندە بە تەوازوعەوە هاتنە مەیدانەوە لە (بڵاوکراوە) زیاتریان بە باڵا نەبڕی ، بڵاوکراوەیەکی وا کە ناوبەناو دەربچێ . ئێستاش کەوا شەش ساڵی زوربەی بەپیتو بەرەکەتی تەمەنی بەسەر بردووەو وا پێ ئەنێشە ساڵی حەوت ، هێشتا لە دەفتەری نەقابەی ڕۆژنامەنووسەکانی عێراقدا ناوی نەخراوەتە لیستەی گۆڤارەکانی عێراقەوە ، هەرچەند هەڵسووڕێنەکانی تەوازوعەکەی جارابنان لا بێتام بوەو ـ حەقیشیانە ـ و ناویان لێناوە گۆڤارو وای لەسەر ئەنووسن ..

سەرەتا ، وەك من بزانم ، ئەوەیان بۆ دانابوو شێوەیەکی بەدەرەتانی ڕۆژنامەیەکی دیوار بێ ، ئەگەر ڕۆژنامەی دیوار تەنها قوتابییانی قوتابخانەیەك یا کرێکارانی کارگەیەك تیا بنووسن کە دیارە لە سەرەتای خۆ تاقیکردنەوەی بەهرەی نووسیندان ، ئەم وابێ هەمووکەس بتوانێ تیا بنووسێو ، هەرچەند بە نیازی کردنەوەی دەرفەتێك بۆ قاڵبوونی لاوانی تازە دەسداوە قەڵەم دەرکرا ، پێشوازی لە هەر نووسەرێکی خاوەن تەجرەبەش بکرێ کە بۆ خۆی بە کەمی نەزانی ناوی لەپاڵ ناوی لاوێکی تازە کاردا ڕیز بکرێ .

بەو نیازە هاتە دنیاو بەو ناوەوە ناسرا ، بەڵام لە ماوەی ئەم حەوت ساڵەدا ئەوەندە پێگەیشتو بەرەوپێش چوو ، ئەگەر تائێستا یەکێ لە ئاهەنگەکانی ڕۆژی ڕۆژنامەنووسانی عێراق ئەوەی بەخۆیەوە نەدیبێت کەسێك پێشنیارێکی تیا بکات بیر لەوە بکرێتەوە بۆچی ( ڕۆشنبیری نوێ ) هێشتا بە ڕەسمی هەر بە (بڵاوکراوە) دائەنرێ ، ئەبێ ئێمە خۆمان ئەوەندەمان لە بەرچاو بێ بە شانازییەوە بڵێین گۆڤاری یەکەمی کوردی عێراقە .

**بڕوانە ل ٨٠**

رئیس التحریر
**اسماعیل رسول**
نائب رئیس التحریر
**فائق جمیل**

نرخی ٥٠ فلسە — ئەم ژمارەیە ١٤٠٠٠ دانەی لێ چاپکراوە — مطبعة الزمان ـ بغداد

رقم الایداع فی المکتبة الوطنیة ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

